ئەوسا لەپڕ نەسیمی بەهاری ئەشنێت و دێت

ئەیخاتە سەما هەراڵەو و خامە تووڵ

ئارام و لەسەرخۆ کە دێت و دەچێ

دائەوەرێنێ دڵۆپی بێ شک و گوڵاو

عەتری ئەدا بەنەسیمی بەیان

تا کوورەی دا، لە دەماخی

سەرمازەدەیی، زەمهەریر

هەراڵەیی خەملاو

***

ڕنەی دەواری ماڵە کوردە گوڵاوپاشی خێڵ و هۆز

خرمەی دەواری کەڕە

***

مۆسیقییە، نەوایە، خوایە! چە خۆشە

فەسڵی بەهار

چ جوانە نەخشی کردگار

***

جێژنانەیی سروشتییە نەخشی کێوو شیو

بۆ خاوەنی هەست و دەبەنگ

بۆ مەست و هۆشیار

بۆ مەلی هەژار

نە نە بەڵکو بۆ هەموو گیاندار

وەسفی بەهارە کە ڕازانی خەڵکی گێتییە

هۆنەر بە شیعر و نووسەران بە وتار

پێم وایە براینە، ڕاستەکەی ئەوەبێ

نایێتە وتن نەخشی کردگار



منیش، وەکو خەڵکی، ئەوەم کە زانی وتم

لە سەناو و وەسفی بەهار

ببوورن ئەگەر نارەسایە باسەکەم، ئێستا وتم

لە وتن نایێ بە نەسر و بە شیعری عەرووزی

بە ئازاد و نوێ تا ئەگاتە وتار

***

عابید! بنووسی ئەگەر دەفتەر و تۆمار

هێمان نەتوتووە یەک لە هەزار

لە وزەی زمان و زاری قەڵەم

لە هەستی هۆشیار، بەربەڵاوترە

تابلۆیی نەوبەهار

پێم وایە لە بری هەمووی چاترە بڵێی

نەورۆز پیرۆز، لە هەموو کوردێ

چ لە دێ بێ

چ لە شار

## **مام جوامێرو خوله**

خوله:

پیرەمێرد! سەلام، بۆکوێ؟
ناترسی تەنت وشک هەڵێ؟!
هەوا ساردە، بۆرانە
تەم و مژە، ڕێ بەندانە
بەتایبەتی ئەم هەورازە، کرێڵەی سەخت و ناسازە
هات... هات! پیرەمێرد! دانیشە هات!
گێژەڵووکە و گەردەلوولی ناهاڵ
گەیشتە تیغە شان و یاڵ
لە بەینمان ئەبات، وا هات وا هات.
گۆبەندە:
گێژەڵووکە، دەنگی بۆران
تەپوتۆزە لوورەی کوێستان
هاژەی چەم، گەردەلوول و تەم
ونی کردن لە پێش چاو
بەر لەوەی بگەنە بەر کاو
دەنگی نەما پیری پەرزاو
لەگۆکەوت مێردی لاو، تەواو تەواو
ڕۆژی ڕوون بووە شەوەزەنگ
مامەوە دەستەوئەژنۆ، بێدەنگ
دانیشتم مات و دەبەنگ
چاوەڕوان مام بۆ سەرئەنجام، بۆ ئاکام
ئەمجارە ئاسمان هەڵیبرنگان



بە ئەستەم دەرکەوت دیمەنی توورەی کوێستان
دیم پیرە مێرد بە زۆری گۆچان
وەک گرۆڵە بەفرێ بەلاما، لەرزان، بێ گیان
ڕۆیی بەدەم لەرزەوە، خۆی ڕائەوەشان
دیسانەوە ڕێگای هەورازی گرت
نەبەزا، بەرەو لووتە ورد ورد ڕێی ئەکرد

خوله:

ئەهای پیرەمێرد! بۆ کوێ؟
بێ بەرەوخوار ناگەیتەجێ! مەگەرشێتی وا بێعاری؟!
سەرگەردانی یا هاری؟ یا مۆتەی کوێستانی!
ئەمجار کوێستان بیتورشێنێ
دەمار لە ژینت دەردێنێ
ئیتر دەنگت ناگا بە کەس
ئەتنێتە گۆڕ، هوژمی هەرەس

مام جوامێر:

کوڕم، ئازیزم، چاوەکەم! لە من گەڕێ کە چی ئەکەم
بۆ خۆت هەر جۆر مەیلت لێیە
وا بکە چۆن لای خۆت بەجێیە
من بڕیارم وا دا، لای خۆم
تا سەر کەلی هیوا بڕۆم
نە با و بۆران و گەردەلوول
نە هاژەی چەم و لوورە لوور
نە تۆفان و نە با و هەرەس
نە گیڤەی بۆران بێبڕەس
ناتوانێ سستم کا و، وڕەس، بۆ هیچ لەوانە نیم دەربەس

خوله:

ئەی بەڵام دا لە ئاواتت!
لەسەر سەختی و خەیاڵاتت
لە ئارەزووت و خەباتت
ناگەیتە سەر لووتە ئەمری! لەکوێ مەعلووم بەرگە بگری؟
ئاخر ئەم ڕێگە سەخڵەتە
ئەم گشتە ڕەنج ومەینەتە
بۆ کێ! بۆچی! بۆ چ کاتێ؟!
پیری داماوی پتورکاو!
تیا چووی مردووی، ژیان نەماو!
دڵم بە حاڵت دەسووتێ، ئەزانم ژینتە دەفەوتێ!
بە کەڵکی چی دێ ئارەزوو؟
ئاوێتەی گڵ بێ زووبەزوو
پێش لە گەیشتن بە ئاوات
ئاواتەکەت سەرت ئەخوات

مام جوامێر:

ئاخر ئەی ڕۆڵەی شیرینم!
نەونەمامی باغی ژینم!
تۆ ڕێگات لەوێ لێ شێوا
بە هەڵە چووی بە نەشێوا
لە ئاواتی خۆت مایتەوە
لە خۆڕایی پووچایتەوە
تاوەکو سەختی نەچێژی
نەمامی مەینەت نەنێژی





ببەزێی ئاسان لە کاردا
خۆت نەگری سفت لە مەیداندا
لە بڕیارا وەها کز بی
ناگەی بە ئاکامی ئاوات، لە ژینا قەت لەسەر بیسات
ئەگەر گیانت دا لەڕێیا، شێرانە وەستای لەپێیا
زیندوویت و قەت نامری، ماوی
ئەگەرچی ماندوو و پەرزاوی!
هەرکەسێ زوو هەراسانە
شپرزەی ڕەنج و تۆفانە
ناگاتە جێ، ناگاتە جێ
ڕێگا ئەگری بۆ سەرکەوتن؟
کوا سەرکەوتن بە بێ کەوتن

خوله:

پیرەمێردی هەزار ساڵە
مەڵێ: خوله زۆر منداڵە
تێناگا لەم قوم و قاڵە
وتارت تینی تێ خستم
ئازاییت سەرسامی کردم
بڕیار بێ تا کەلی هیوا، منیش شوێنت کەوم هەروا
تا لووتەی هەوراز نەسرەوم
بڕیار بێ بێم بەدوای تۆدا
پێ بە پێی ئاوات و سەودا
گوێندە:
ڕەشەبا گیڤەی لێ هەستا

پڕ تەوژم و زەبەند، ئەوجا
(خولە) لەگەڵ مامە (جوامێر) دیسان ون بوون
نوقم بوون، جووتە دلێر
هەم تورشاندی هەوای کوێستان
ون بوو، نەما ناوونیشان
وا دایتەمان بەفر و بۆران
پاش سێ سەعات هەڵیبرنگان
تەماشام کرد سەر لووتەی کێو
مەشخەڵانە و ئاورباران
وتم: سەد شکور گەیشتن
پاشان کاتێ کە (خولە)م دی
دەنگوباسێکم لێ پرسی،

خولە:

وتی: بەخوا مامە جوامێر!
دەرسێکی دامێشبوومە مێر
تەنی لاوازی ڕاکێشا
ناڵەی نەژنەویا لە ئێشا
کردەوەی ئەو زاتی دامێ
ڕێمان بڕی تا دواییی ڕێ
کاتێ کە بۆران تەواو بوو
لووتەی هیواکە زۆر سارد بوو
وتی: کوڕم ئاور هەڵکە
ئاوری پیرۆزی بەکەڵکە
ئاوری پایانی پیرۆزی



ئیرثی کوردە وەک نەورۆزی
دایگیرسێنە با بلێسە بێ ماندوویی ئەم تەنەم دەرچێ
من سەرمامە تۆزە تۆزە
گەڵووی گرتووم پژمەو قۆزە
کاتێ کە ئاور داگیرسا
مامە جوامێر دی ئەوەسا
پاڵ کەوت چاوی بۆ هەمیشە
لێک نا و گوتی: ئەمە ئیشە؟
مردن ئێستا ئیفتیخارە
سەربەرزییە و چارەی کارە
ئیتر جوامێر هەڵنەساوە
بۆ هەمیشە پاڵی داوە
ئەو بۆ من یەک مامۆستایە
بەڕێزە لام هەتا تایە

## هات و نەهات

ڕێبواری ڕێگەی هات و نەهاتم
پێیت خۆشە هاتم، ناخۆشە هاتم
چۆن و بۆی ناوێ، لەبەرچی هاتم
ناخواندە میهمان، ڕیسوای بیساتم
جێم نەبوو کەچی لەخۆڕا هاتم
خۆیشم نازانم لەکۆیوە هاتم
ڕێبوارم هاتم
نەهاتم، هاتم
هاتم، نەهاتم

***

ئەگەر ئەتزانی چەن قەدەمخێرم
نەزرو نیازت ئەکرد بۆ هاتم
ئەر قەدەم شەڕیش بمدەیتە قەڵەم
خێری تۆی تیایە هات و نەهاتم
بەکورتی بوومە هۆی سەر جەنجاڵێت
حەزت کرد هاتم، حەز ناکەی هاتم
لەوەولاتر چم، بۆ ئەملا هاتم
نەهاتم هاتم
هاتو نەهاتم

***

سەر مەنێ سەرم، ئازارت نادەم
ڕێبوارێ خەستە و، لاکەوتەم، پیادەم
ڕەنجوورم، سستم، شمقاڕ لێداوم



زۆر پەرێشانم، پێ خستوو خاوم
قەت لات وا نەبێ کە چاوبەسراوم
شارەزای ڕێگام
تەخت ئەکەم جێگام
نەهاتم هاتم
هاتم نەهاتم

***

هاتم نەییێڵم تۆش سەرگەردان بی
لە مەینەت ئاوای ژینا میهمان بی
ڕەشەبای ڕەش دایوەراندی
بە دەم خەڵفۆ دایتەکاندی
سۆمای چاوان، بەقوربان
نەمامی جوان، هێزی گیان
سۆمای چاوان، بەقوربان
هیوای ژیان، ڕۆڵە گیان

***

ناکاو سووسەم، کوژایەوە
شادکامیم بڕایەوە
باری مەینەت بووژایەوە
دڵم دیسان سووتایەوە جەرگم بە سۆ قرچایەوە
بەری باغم کزایەوە، شادیی ژینم بڕایەوە
ڕۆڵەی من و قوربانی تۆ؟
نازانم زاڵم!
بۆ بۆ بۆ؟؟
کام زاڵم دای لە باڵم

کێ کەندیەوە میوەی کاڵم؟
سۆمای چاوان، بەقوربان
چرای ژییان، ڕۆڵەگیان!

***

ڕەحمی نەکرد بە دڵسووتاو
بڕیی بەندی جەرگ و هەناو
بەرد بباریێ، چەن دڵڕەقن!
جەرگی خەڵکی و مەزەی شەراو
ڕەنجی من و ئاهەنگی تۆ؟
ڕەنجەڕۆ بۆ؟ بۆ بەزمی تۆ؟
خوێنی من و من نەیرەنگی تۆ؟
بۆ سوودی خەڵکی بۆ کوژان؟
ئەو شاد بێ و من دڵم، پڕ ژان
سۆمای چاوان، بەقوربان
چرای ژیان، ڕۆڵە گیان

***

چەن خۆشە کوژران و خوێندان
سەر و ماڵ دان بۆ نیشتمان
بۆ نیشتمان
نەک بتکوژێ بۆ سوودی خۆی
پیلانگێڕان، بێگانەکان
بۆ نیشتمان، بۆ خۆمان
حەلاڵە
لە خوێندا شەلاڵە
ئەگینا بەتاڵە



خەبات کەین بۆ دوژمن؟
ئەو شادان، پەشێو من؟
کەی ڕەوایە؟ بۆچی وایە
سۆمای چاوان، بەقوربان
چرای ژیان، ڕۆڵەگیان

***

هەستن دەستی زاڵم ببڕن
ڕەگی دەرکەن، مەرگی بکڕن
زوو بەزوو ئەو نەنگە بسڕن
تاوان ئەکەن، چاو شۆڕ ئەکەن؟
شلی کەی بۆی، ئەتکا بە پەن
ناوی لەسەر بیسات بسڕن
مەرگی بکڕن، مەرگی بکڕن!
تا نەسووتێ دڵی داکێ
نەچەوسێتۆ سینەچاکێ
شیر خاوێنێ، دەروون پاکێ
ڕۆڵەی عاقڵ! نۆکەر مەبە
بۆ دەغەلاّن ڕەنجبەر مەبە
سۆمای چاوان... ڕۆڵەگیان
هیوای ژیان، بەقوربان

## ئێوە بڵێن چی بکەم!؟

سەراسیمەم، پەرێشانم، چی بکەم
دڵم شکا، هەراسانم هەراسان، چی بکەم
دێوی خەفەت ڕێی پێ گرتووم
ڕێ بڕانە، چی بکەم؟ هاوار، هاوار، دڵدرانە چی بکەم؟
پەلەقاژێ، تەک و دەو، نیوەڕۆ، نیوەشەو
پێڵاوی مەحکەم، کاڵەو پێتاوە، لە پێ دڕاوە
ڕێم لێ بڕا، چی بکەم؟
کێوی نەهات، هەوراز و لێژ
پشت شکێنە، بێ ڕەوەزەو تێژ
نە ڕێ ئەدەن نە بوار، دەسخەرە، زار، زار
بڕۆم ناتوانم، بمێنم پەشیمانم، پەشیمان

***

خەزانەی خەیاڵم پڕی دەردە
بووەتە وەباڵم، بێ پەردە، ئەڵێم بێ پەردە!
ئەفکاری ناهاڵم
بەری نارەسی خەیاڵی تاڵم
دای لە چۆکم، دای لە باڵم
پشووم نادا داکەوم، دەنگ نەکەم، بسرەوم
ڕێ ئەنێتە بەر پێم، بەڵام بەستەپێم
پێم ناکەنۆ، لەسەر ڕێی نیم
هاوار ئەکەم، ئەناڵێنم
نابیێن، ناڵەی زارم، دەنگی زەراڵم
ئەی خوایە! کە پێ کراوە ڕێییێ بنێ بەر پێم



دەسم بگرە با بێم ڕووەوتۆ بێم
ستەمە دەرچوونم لەو بەندە، نەگەی پێم
ئەڕەتێم بەڵام نایێڵن بگەیێم
هەرچی سەیر ئەکەم نارێکە، لارە، نەیرەنگە
خۆم پێ ناگیرێ، دڵم تەنگە
کەس دەربەسی کەس نییە، نەفسی نەفسییە
مەیلم لێیە دوور بگرم، بمرم، بمرم
لنگی لێ ڕاکێشم، پشوویێ بگرم
بەڵکو، بحەوێمەوە، ئارامێ بگرم
بەڵام تاپۆی ستەم هەر دیارە، لە پێش چاومە
حاڵم زارە
چی بکەم دیارە، هاوارە
هەموار ناکرێ پەسا نادرێ
دڵ و ئاوەز، بەزەیی، بەرگە ناگرێ، بەرگە ناگرێ
خاوەنی هەست ڕۆژی هەزار جار ئەمرێ، ئەمرێ
دەسی تەنیا هیچ ناکرێ
ئەی هاوار! ئێوە بڵێن، چی بکەم
ئێوە بڵێن چی بکەم؟!

## خەیاڵی خاو

ژیرلە:

گوڵی بەهاری! ناتژاکێنم
خۆشم ئەوێی و ئەتدوێنم
مۆچیاریت ئەکەم
ناتخاوێنم
پڕوپووچ ناڵێم، ناترەوێنم
ئەو ژینە کە وەها دێت و دەچێ
وریای بە با بە خەسار نەچێ!
تا گەنجی قەدری بزانە
بارەی لێ ببە، نە پیلە و نە بەهانە
ئەوەت بەسەرا دێت و دەچێ
ساتێکی لە ئانێ دێ ناچێ
هەر ئەڵێی باهووەی کوێستانە
دەتوێتەوە ئەو ڕۆژە (نیسانە)
خۆی ناگرێ چارەیی چوونە
لەعاستی، تاوا، زەبوونە
عومری من و تۆش ئەمساڵ بۆ ئەو ساڵ
لە بەین ئەبا تەواناو حاڵ
هەر ساڵ ئەچێ، ئەڵێی هاوار
خزمینە، داد! خۆزگەم بە پار
سوننەتی حەیات هەر وایە، هیچ نامێنێ تا هەتایە
تۆش ڕۆژێ وەک منی هەژار
دەبیتە لانەی عەیب بێ ئیعتیبار
ڕۆژێ لە ڕۆژان تۆی داماو
ئەبیتە لانەیی زووخاو



ئەی داخەکەم، لە دەستم چوو
نازانم کە هات بۆ چوو؟

گەنج:

هۆ مامە! سپاس، ماڵ ئاوا
ڕاتچڵەکانم لە شیرین خاوا
چەن جوانە قسەی نەستەق و ئەندەرز
بە زمانی پاراو، واتەی بەرز
هەرچێکت وت تێگەیشتم
حەقت بەدەستە، هەڵە ڕۆیشتم
یادت بەخێر ئەی لاوی
داخی سەختم فەوتاوی
نەمزانی چیت، لێم ببوورە!
ببەخشە زۆرم قوسورە
(هێژا) ئەگەر نەتیناسیی
ئەتناسینێ بە خاسی و ڕاسی
تا بەڕێز بی لای خەڵکی
وا نەزانن بێ کەڵکی
خەوێ بوو دیمان، یاران!
خۆزگە بە جارەکەی جاران
نایێتەوە بیپەرەستم
سەد حەیف، دەرچوو لە دەستم
ئەی هەناوی براو
عومری فەوتاو
ناگەڕێتەوە، ناگەڕێتەوە
ئەی عومری بەتاڵ
ئەی خەیاڵی خاو!





## ئافەرین فرمێسک

گەوهەری غەم، فرمێسک
هۆن هۆن دێتە خوارەوە، بە ئاشکرا و لە پێوارەوە
یەک لە شوێن یەک دائەوەرێ
بەری درەختی ستەم
گەوهەری غەم
گەوهەرێکی رەنگین
ئەتکێتە بەر چاکی سەبر، ناو کۆشی غەمخوار
بەر چاکی داکی غەم
غەمڕەوێنی بەربەیانی ستەم
هۆن هۆن، سەنگین و رەنگین
هەڵمەتڵێ داغ، خوێنین
دێتە کۆش، ئەحەوێتەوە لەوێ
بەخێوی ئەکەن، پەروەردە دەبێ
ئەگەشێتەوە، ئەشنێ ئەشنێ
سەرئەنجام دێتەبەر، دائەپشکوێ
بەڵام چی ناگرێ؟ هەموو شتێ ئەگرێ، ئەزێ
بەڵێ: تۆلە، خەبات، راپەڕین، هێرش، شۆڕش
بەڵێ دانەی غەم، گەوهەری ماتەم و ستەم
ئەڕوێ، دائەپشکوێ، بەر ئەگرێ
بەری رەنگاوڕەنگ، جۆراجۆر، ناشیرین و قەشەنگ
دوژمن رمێن، شێر شکێن، دڵتەزێن
ئافەرین، نۆشدارووی گەلان!
ئافەرین! ئەی هەڵتلانت پەیکی راپەڕین
ئافەرین! تنۆکت زەنگی بیم



بانگی هەراس
ئافەرین، خۆراکی رۆح، مایەی ژیان
ئافەرین، خەمیرمایەی قین! ئافەرین
بۆ ستەمگەر، بۆ خودخواە
ئافەرین، هەزار ئافەرین
ئافەرین، نوێنەری تاوی دەروون
ئافەرین، ئەی ئارەقی تاقی حەمامی غەم
ئافەرین، نوێنەری تەم، تاپۆی غەم
ئافەرین، هەر قەترەیێکت دونیایێ
ئافەرین، هەر هۆنەیێکت سەودایی، هەر تلێکت مەعنایێ
ئافەرین، هەر دانەیێکت غەوغایێ
ئافەرین، ئەی گەوهەری غەم، ئافەرین
ئافەرین، ئەی پشتیوانەی شادی
ئافەرین، ئەی هەڵاتووی نامورادی، ئافەرین پەیکی ئازادی
ئافەرین، ئەی تەریدەی موڵکی غەم
ئەی نوێنەری ستەم، ئافەرین
ئافەرین، ئەی ڕێبواری چۆڵی نهێنی
ئافەرین، مایەی جۆش و خرۆش
نوێنەری هەستی خۆشەویستی
نموونەیێ لە خواترسی، توندپای وەتەن پەرەستی
پەیامبەری شاری دۆستی
ئافەرین، ڕەمزی دونیای ئەوین، ئەی جۆشی دەروون
ئافەرین، گەوهەری عیشق
ئافەرین، دوڕدانەیی تاسە، ئەی غەمی گۆیا!
ئافەرین، ئەی فرمێسک!
ئافەرین، هەزار ئافەرین...





## ئینتیزار

پایز بوو، شەو زرنگایەوە
ئەستێرەکان گەشایەوە
هیوای دڵم بووژایەوە
هەوا ساف و بێ گەرد و پاک
ئاسمانی شین بەراق، رووناک
لە جێ ژوانا ماتڵ، غەمناک
سەرگەردان، دڵتەنگ، سینە چاک
ماندوو بووم، مردم هێند مامەوە
باوێشک سەری لێ دامەوە
تەزیی دوو پێم، وەنەوز، باوێشک
شەوگارم شەق کرد، دوور و درێژ
چاوەڕێی دۆست، نەهاتەوە
هاتم و چووم... زۆریش گەڕام
نەگەڕاوە، نەگەڕاوە
لە جێ ژوانا هەر ماتڵ مام
بێ حاسڵ، بێ سەرئەنجام
چاوەڕێ، بەڵام بە کوڵ بە سۆزی دڵ
نامراد، بێ حاسڵ
جاروبارێ وەڕەی سەگوەڕ
لە دەوری خێڵ، لە پاڵی دێ
دەنگی هاندان حەلەل حەلەل
ئەبوە هیوای دڵەی دەیری
پڕ پەژارەو ڕوئیای سەیری



دڵە دەیوت: لەبەر خۆیۆ
واهاتۆ، هەڵدێ مانگی نۆ
کەوی خۆشخەرام و سەرتەڵ هاتەوە
خاڵ و میلڵ ڕەشتەی سەرپۆل هاتەوە
دڵەکورکێ لەتاو ڕووبەڕوویی دۆس
خەوە نووچکێ، وەنەوز، نادیاریی دۆس
جاروبار وەنەوزی خەم ئەمباتەوە، دائەچڵەکێم و ئەڵێم
لەنجەولارە خۆش کەی بگاتەوە
ها ئێستاکە دێ، ها تاوێکی تر
موژدە موژدەیە: لەیلێ هاتەوە، هاتەوە

***

ئینتیزاری دۆس هەر تەواو نەبوو
دەنگی سیسرگی شەوگاریش تیاچوو
دەلاقەی شەویش وا کرایەوە
ئەو ئینتیزارە هەر نەبڕایەوە
سەربەناز، بێ گەرد و خۆشخەرام، تەنناز
خیلاف وادەی کرد، لەیلی دڵنەواز
بەربەیانی سارد، فێنک، کشومات
تەزەروی خۆش ڕەوت، چۆن بوو وا نەهات
دەی هات هاتی ڕۆم هەر نەبڕایەوە
دەرکی بەزەیی هەر نەکرایەوە
کەم کەم دەبیسرا جیکەی پاساری
گمەی فاختەی باغ، شۆری کەناری
نەوای بولبوڵ و ئەم چڵەوچڵ
نەهاتەوە، خۆ فێنکی جەرگ و دڵ





ئارامی گیان، نەهاتەوە
غونچەی سەرچڵ نەهاتەوە، نەکرایەوە
بولبولی دڵ نەقلایەوە
چاوەڕوان، ئینتیزار، بێ قەرار
لەسەر شەو تا سەحەر، دەردی سەر، بێ سەمەر
تامەزرۆ، ماتڵ، هەتا کەی؟
هەموارم کرد غەمی دووری بە خۆگرتن، بە سەبووری
بەو مەرجەی سەرئەنجام، دەمکاتەوە غونچەی هیوام
بەربەیان، سەحەردەم، زۆر خۆشە چەم و خەم
ئەحەسێتۆ شەو بەتەما، تەم ئەڕەوێ لەگەڵ خەما
بە دیدارێ لەبیر ئەچێ شەو نەخوسی، خەستەیی ڕێ
ئینتیزاری و کەی بێ، کەی بێ



## بیرەوەری

چەم و چوخوڕ و تووترکی دڕ
کانیاوی ساف و سارد و ڕوون و خوڕ
قەڵوەز و تاف یەک لەشوێن یەک
دەنگی مراوی، جیکەی ئوردەک
هەوا فێنک، دۆڵ کشومات
قریشکەی شابازی چەرمووی حوڕ
شۆری بولبوڵ، نەوای فاختە
هەراڵەی ڕەنگ و بۆ باختە
لە خاترما وێنەگەرە، تابلۆسازە، باهونەرە
ڕابردووم زیندوو ئەکاتۆ
لەبیرچووم وەبیرئەخاتۆ
درەختی کۆنەساڵ و زل
خامە تووڵی، ملوێن لە مل
دارستانی چڕو زەبەن
پێچ و ئاوێزەی یاسەمەن
سایەی تاریکی دارستان
چناری هەڵچووی ڕێک و جوان
چنگ بەرەوژوور بەرەو ئاسمان
هاژەی چەم و زرمەی قەڵوەز
تافی ساف و هەڵبەز هەڵبەز
چەوی ڕەنگاوڕەنگی بن ئاو
کە لێ بدا تاوی هەتاو
گشتی بۆ من پڕمەعنایە

یەک یەکی زەوقی تێدایە
هەر تابلۆیێ لەو دیمەنە
سووژەییێکی دەوڵەمەنە
گراڵەی تابلۆی خەیاڵە، مایەییێکی بێ زەواڵە
هەر کامی تیری ئینشایێ
هەر گۆشەییێکی مەعنایێ
ئای بۆ پێنووسێ کارایێ، ڕەقەم کێشێکی گۆیایێ
هەرگیز لە کار نەکەوتایێ، لە نووسینا نەمانیایێ
خاترەی تەنزیم کردایێ
پەڕاوی ژینی ڕابوردووی
بە وردی و چاک بنووسیایێ، لەپەڕا وا دایڕشتایێ
لە تابلۆدا بیکێشایێ
کاکە! ئەمڕۆ لە دوێ ناچێ
پێت وا نەبێ بوو تیاناچێ
گۆڕان خەواسی مەوجوودە
حیکمەتی ڕازی مەعبوودە
چاو قرتانێ ڕاناوەستێ، ئاڵوگۆڕی هەستی هەستێ
جا ئەوەی هەیبێ پێویستە
نیازمەندی قەیدی لیستە
ئەوەش لێشاوی خەیاڵە
نەبێتە تابلۆ بەتاڵە، نەبێتە نۆشین زەواڵە
هەروا مانەوەی مەحاڵە، بنچاخ پێویستە و قەباڵە



## **بڕوا**

لە شاخ و داخی هەستیبیا پەنگاو
لە گێژی خەم و پەژارەدا
هەبەسیاو، تاساو، ژاکاو
لەسەر ئاسۆی کێوی وەرهەمی ستەم
تەنگەتاو، تەنگەتاوی غەم
چنگاوشی مەبەست
پەرزاو
لە تۆفی بۆرانی زستانی مەینەتا
لە کرێڵەگای سەخڵەتا نیوە بەزاو
ژاکاو، هەڵبزرکاو، خنکاو

***

سەوداسەری گەیین بە مەرام و مەبەست
یەکەناس و ڕاساڵ و مافپەرەست
لەو گشتە تەنگانەدا
کەڵەمێردی ئازا
لێوی نەگەست
وەڕس نەبوو
هەڵنەهات و نەچوو
وەک شێری ژیان یا بەبری بەیان
یا پڵنگی شاخی کێوی کوردستان
سەربەست
بێوچان بەرەو مەبەست
پڕ تەکان و هەڵمەت

بێ تەگەرە و شکان هەڵبەست
تاقە و تاق
بۆ کەلی هیوا
وەک کەڵی پۆپەی پەڕاو
بە وزاق
گەیشتە بەر کاوی ئارەزوو
کەڵلانی هیوای زوو
لە هەواری مەراما
لە ئاواتەخوازی دێرینا بەست بەست
سەرمەست، مەغروور
سەربەست
پشووی دا، لە لانی ئارەزووا لەمی دا
لە بەر کاوی مێژووا
نەبەزا، نەتەزا
لە مەرامی دێرینا
لە لانکەی ئارەزووی ژینا
پشووی دا، بنەی گرت
لانی ساز کرد
نەمرد، نەمرد
ئەوەتا سەرئەنجامی بڕوا
بڕوات هەبێ، بڕوا، بڕوا



**تەتی پتی**

لەوێ کە فەریادی کەڕ و لاڵ دێ
بە ئاهەنگی بەرز و زەراڵ دێ
هەزار و یەک شەوی شەوەزەنگی ژین
ئەگێڕێتەوە
پەندی سەنگین ئەخوێنێتەوە
لەوێ کە مەسنەویی غەم
مەعنای ئایینی ئوێنی ستەم
فەلسەفەی ماتەم
دووبارە ئەکاتەوەو پێت ئەڵێ:
ها پیاو چ قەوماوە؟
ئاشی گەردوون، لە ڕاستە ترازاوە؟
بە بێ چەنوچوون ئەڵێن بە بێ حاڵ
بە کوڕوکاڵ، بە منداڵ
ڕۆڵەگیان: ئاش بەتاڵ، ئاش بەتاڵ

***

ئەوەی درا بە گوێتا و دیت
هەمووی، دیدارێ گوزەرا بوو
بنج و بنەوای نەبوو
تیاچوو، تیاچوو، ڕۆیشت
گشتی ڕەنگ و هەمووی نەیرەنگ بوو
شانۆ بوو، هات و چوو
ڕاستی و دروستیی بەجارڕا نەچووبوو
گەردوونەی زمان بێ وچان

هەڵیخولان، هەڵیتلان
دووبارەی کردەوەو ڕۆیشت
بە پێش چاوا، بە تاو دەرچوو، زوو زوو بەڵام
لاڵی پێ هاتە گرۆگاڵ سەرئەنجام
ئەو داستانی دەوت، شانۆی شەرح ئەکرد
تۆ بەڵام تۆ بە وڕاوەت دەزانی
بە ڕاستی وڕاوەت دەبیست

***

لێقەوماوی سەرپەتی
هەژاری مەینەتی
تێشکاوی بێوڵەتی بێدادی دەکرد
ئەی کردەقاڵ و چەرەند و پەرەندی
بێ پەروا دەوت
ئەیدا بەری لە ترسی گەزەند
پەڵخوردی ئەکردو هەڵیئەخولان
مەبەستی گرنگی ئەپەڕان، ئەیخستە سەردان
تێکی ئەشکان، گونگ و نەوی و بێگیان
پچڕ، پچڕ، تەتی پەتی
ئەیدا بەیەکا، شەڵوپەتی
هەندێ بە ڕووناکیی دەروون
هەست ئەکەن مەبەستی ڕوون
لەززەت ئەبەن بێ چەن و چوون
تێدەگەن، زاراوەی زەبوون
گرۆگاڵی دڵ، زمانی لاڵ، بەڵام
لای دەبەنگ و پێ بەتاڵ



هەژارەو سەمە، پەرێشان حاڵ
دایناوە گاڵە گاڵ

***

خۆزگا تێدەگەیشتن زمانی حاڵ
خۆزگا ڕۆژێ بەسەر لەوحەی سیماوە
شەقڵی دەروون ئەخوێنراوە
ئاشکراو ڕوون، بوخچەی غەم
ئەکریاوە
تا دەردەکەوت، هەزاران شاراوە
تا دەناسرا بیماری ڕەنج
تا تار ئەنرا ماری لای گەنج
تا پەس دەبوو دێوو درەنج
ماندووی دەرئەچوو، ئەحەساوە
ئەگەییە سەر بەری ئەمان تا
ئەگەیشت بە گەنج، یاوەکو بە ڕەنج
جا بۆی ئەلوا گرۆگاڵ کا
بێ وچان: تەتی پەتی
بێ دەردیسەر بداتەدەر
نەوای دەروون، بێ سەرەخەر، هەژاری دەربەدەر
بەو چەشنەی دڵ لێی ئەخوازێ
ڕاست و ڕووناک، شاد و بێ باک
بداتەدەر، شام و سەحەر، دانەی گەوهەر
ئەوجا:
بهێنایێ بەسەر دلا
دەستێ ئارام بە جێی چلا

نەترسایيێم پەست و ناکام
ئەمرەوێنن تا بێئەنجام
زوو تیا بچم سەرتاپا زام
بێ سەرئەنجام بێ ئارام بکەومە دام
زاری لالم بەربووایێ
سەرێکم بێت و سەودایێ
ئەوی ئەمویست بموتایێ
لەترسا لێم نەشێوایێ
خەڵکیش نەڵێن ئەی هەژارە
چی بکا کە دەنگی دەرنایێ
بمکردایێ بە قرم و قاڵ
بە ئاوایێ گەرم و زەراڵ... بە زمانی پاک
بێ پێویستی بە لاڵە لاڵ
جارێ دایێ ستەم تەواو
هارەی شکا ئاشی ناباو
وا پەکی کەوت، داماو سرەوت
ئاش بەتاڵە ئاشەکەی خەوت
ئاش بەتاڵە، ئاش بەتاڵ



## بریا

بڕبەندی ڕۆژگاری جەفا
لە پۆڵای سەفا و ئاسنی وەفا کەوتە کار
بۆ ڕادەی داپەڕان، ئاردەشانی سەوهان
چاوی ئاوەزی، پڕ کردەوە
بەداخەوە
گلاراوی پێ خست و لێی بڕی بڕست
نۆشدارووی چارە، یا جەواهیر سورمە
کوا دیارە، کوا دیارە
لەژێر تەنگی ئەرژەنگی زەنگیدایە
کێ خۆی ڕاوەشێنێ و لە دەستی دەربێنێ؟
کێ بێ و شارەزای دەربەندی دەروونی تووشی بێ؟
کێ توونکە توونکەی تەنگی تاریکی ڕازی چەتوون بزانێ؟
ڕازی درنج شارەزا بێ، کێ؟!
تا ڕێگای مەینەت ئاوای، نەزانی بپێوێ
هەموار کا و بگاتە جێیێ
بگاتە سەرئەنجام
بریا دەبوو، بریا هەزار بریا
سەد هەزار خۆزگەو بریا

## بیراز

هارەی ڕۆژگار بێ ئەندازە تیژە
تیژ و تازە بیرازە
ئەمهاڕێ، هارەکەی خودکارە، خۆسازە
ئەتهاڕێ، بە خۆت مەنازە، یەواش بڕۆ
وریابە خۆت مەبازە، دیرە تازە، دیرە تازە
گەردانی گەردوون بە مەرامی دوون
هەڵدەسووڕێ، هەڵدەخولێ
هەر بێ تاوانە، هەڵدەتلێ
بۆ چی؟ بۆ کێ؟
هەر وریایەو پەڵخورد ئەکرێ
هەر زەلامە ناگا و ورد ئەبێ و ئەمرێ
ئاوی ئەو ئاشە لەکوێوە دێ؟
کێ ئەو گەردانەی خستەڕێ؟ کێ؟
ئارێ... بارێ
مزەگیری هەیەو نانی دەوێ
ئەمشەو سبەی مزە ئەگرێ
نانی دەوێ، نانی دەوێ، جا
نایەوێ پەکی کەوێ
وەستا کاریش تیژ دەکاتۆ
زەخیرەی منداڵ و خێزان دەباتۆ
مشکە کوێرە کە ئاو ئەخا
بێڵی میراو، لە بەینی ئەبا
کە وابوو هیچ چارە نەبوو



وردەپل بوو، وردەپل چوو
پێویستە بنەوانی بڕوا
دیوارەی بدرێ بە ئاوا
سەرناساری بڕووخێنرێ
تا ئاو نەیێ، لە کار کەوێ
ئاش زوو لە گەردانی کەوێ
بەرداش بشکێ، هار بسرەوێ
تا دانەوێڵە نەهاڕێ
هارەی گەردان لە خول کەوێ
ستەم لێ چوو جا بسرەوێ

## ڕەوە، ڕەوە

ڕەوە، ڕەوە، تەقڵەدەوە
کوڕی باوکی فریا کەوە
ئەو هەراو هووریا بژنەوە!
قیژەی منداڵ، زارانەوەی
شینی ئافرەت، پاڕانەوەی
بڵێسەی دەروون، سووتانەوەی
چاوەڕێی و لاڵانەوەی
وەی من، وەی من، وەی ڕۆڵەی من
هەی باوکەڕۆ، وەی خۆم، وەی من
کوا ڕۆڵەی من، کوا ڕۆڵەی من؟!
هەناسەبڕکێی پیرەژن
هەستانەوە و دیسان کەوتن
کۆکە و قرخەی پیری زەبوون
لەپێ کەوتوو، بۆ هاتوچوون
ڕۆڕۆ لەگەڵ قرچەی دەروون
بەڵام زەبوون و گەرووتوون
کەی بێ بگاتە گوێی گەردوون، گەردوونی دوون
ڕەوە ڕەوە، ڕۆڵەم! ڕەوە!
کێ بیژنەوێ؟ لەم جیهانە؟!
دوو پێی خوێنخواری دێوانە؟
مردوودڵی شوومی بێعار؟
سەر هەتا پێ فیزو دەمار؟
بێ دین، بێ ئەمان، خۆپەرس؟



ئەخلاقسزی نا پیاوی دز؟
ئەتوار لەقی هەرزە ویجدان؟
نەژنەوا، بێ بڕوا، بێ ئیمان؟
ڕەوە، ڕەوە، ڕۆڵە ڕەوە، کەس نابیسێ، تۆ بژنەوە

***

خوێن ڕشتن و هەژار کوشتن
خەڵک ڕاونان و ماڵ شێواندن
هێلانەتێکدان، بێ ویجدان
ئەویش هیی کێ
ماڵی کوردان
هیی هەژاران هیی موسوڵمان
ئەویش بە چی؟
بە تەیارە بە تانگ
بە تۆپ، بە قومپارە
بە کیماوی، بژار بە ژار؟
چییان دەوێ، چی ڕوویداوە
چ بەزمێکە و چی قەوماوە؟
ڕەوە، ڕەوە... ڕۆڵە ڕەوە!
کوڕم ڕەوە، کچم ڕەوە، ئافرەت ڕەوە!
خوشکە ڕەوە، باجی ڕەوە
دە بێ هەموار کە و بسرەوە

***

لە جەریمەی کام خەتادا
لە قیمەتی کام سەودادا؟
سێنگی نەکرد بۆت بە سپەر؟

مەردانە نەچوە ناو سەنگەر؟
دوژمنی تۆی نەکردەدەر؟
(فەلەستین)ی بە خوێنی خۆی؟
نەجات نەدا بە دەردی سەر
نەیکردیتە خێوی وەڵات؟
دوژمن لە تاوی هەڵنەهات؟
زنجیری پێتی نەکردۆ؟
نەیپچڕان بەندی دەست و پات؟
ژن و منداڵ و خێزانی
بە سەر ڕووتی و بە پێپەتی
لە کۆیلەیی ڕزگار نەکرد؟
هەزاریان لەو ڕێدا نەمرد؟
تا بتکاتۆ بە خانەخوێ
بوون و نەبوونت تیا نەچێ
تا دیسان سەر بێنێتە دەر
لەو بەندە بتکا بە سەروەر
ئا وا جەزای مەردیت داوە؟!
دەک دارزێیت و داوەشێی!
بۆ لەعن و نەفرینم دەشێی
ئیسلام وای وت یا پیاوەتی؟
کێ ئەمری کرد، کێ پێی وتی؟
داغ لە دڵانی کوردستان؟
کردیتیە پەن، هەڵتیخڕان!؟
بۆ گیان جەنگ ئاوری کوردان
لەدژ شۆڕەسواری گۆران؟ کەڵەمێردانی ئاردەڵان



شێرە مێردی خاکی بابان؟
دەبێ کاول بکرێ ماڵی
پەرێشان بکرێ ئەحواڵی
نەکا لە نوێ جارێکی تر
پشت ڕاس کەنۆ لە زوو باشتر
ڕادەنە مەیدان بێچوە شێر
ئازادە مێردانی دلێر
یادێ لە بەیتی مەقدیس کەن
شۆڕشگێڕانە هێرش بەن
سپای دوژمن تارومار کەن
ئەبولهەولی نوێی لەتار کەن
سرایل تەفرو توونا بێ
حەقیقەت بۆ خۆی گۆیا بێ
ئەمە، ترس و بیمی ئەوە
نەفام تۆ چیتە؟ داکەوە!
کوردی موسوڵمان بۆ بکوژی؟
بۆ هەڵدەسیتۆ لەدژی؟
تێکئەدەی تالار و دژی؟
قەپ ئەکەیتۆ بە ئەژنۆتا
لە نادانی و پەستیی خۆتا
بەڵام کاتێ کە بێکەڵکە
پەشیمانی چی؟ خۆت هەڵکە!
لە نوێژ ناچی بەم گشت پەندە
کردارو کردەوەت گەندە
موژدە بێ دێر یاوەکوو زوو

ئەبیتەوە بە بەندەی جوو
دینی ئیسلامت بۆ ون کرد؟
براییت بۆچی وا لێ کرد
یەکیەتیت ڕیشە دەرهاورد
توحفەی تازەی عیرقت هاورد
(عرووبە)ت گرت بەدەستەوە
خۆتت بەو بەندە بەستەوە
نە بە ئەم بووی نە بە ئەو بووی
هەڵەت کرد، داخەکەم، تیاچووی



## لافاوی سوور

چۆمی خوێناو، لافاوی سوور
تل دا لاشەی زەخمی ڕەنجوور
هیی ئازادە مەردی دلێر
هیی گەنج و لاو
هیی بێچوە شێر
هەڵیماڵێ بۆ دەسەوناو
بەرەو چۆم بۆ گۆمی خوێناو
پڕتاو پڕتاو و، بێ پەروا
بەرەو گۆمی خوێناو، بۆ وا؟
تا سفرەی ستەم ڕەنگین بێ
ئازادە گیانی برین بێ
گوڵدەستەی سەر، مێزی دیوان
ڕەنگاوڕەنگ بێ و تێراوو جوان
ئیتر بە کام خوێن، بیڕەژن
لاوی کام، قەومی بۆ بکوژن
تا پاراو بێ و چاک بدرەوشێ
بۆ مەجلیسی ئەرباب بشێ
گوێی لە تانە و توانج کەڕە
چی تەڕ بکەی، ئەو خۆی تەڕە
کێ بژنەوێ ناڵەی زەبوون؟
بێ ویجدان و پەست و چەتوون؟
ئەمە تەمەنناى بێ جێیە
هەڵەتگایە و کوێرەڕێیە

کێ بەکێیە و کێ بەکێیە
هەناسە سەرد
سەرتاپا گەرد
خەستەو پەرێشانی نەبەرد
ماندوو و مردوو، لاواز، ڕەنگ زەرد
بێ سەرئەنجام
ڕەنجی بێوەر، خەستەی ناکام
خوێناوڵێن و سەرتاپا زام
سەرت لەوە سڕنەمێنێ
هەنسکی سارد نەتخنکێنێ
مەڵێ بێ سوود، بۆچی، بۆ کێ؟
ئەوی کە زاتی چەپەڵ بێ
ئەبێ بارەکەی گێچەڵ بێ
کەوە ماری ناوجەنگەڵ بێ
خەوی گەستنت ئەبینێ
مەکرت بۆ دائەپژگێنێ
حەزی لێیە پێتۆ بدا
بەشکەم زووتر لە بەینت با
چاوەڕێی چیتە لەو تیپە؟
دۆزەخی، چی دی نازانێ
بیبەوێ چا بێ ناتوانێ
حەزیش کا لێی ناوەشێتۆ
نیمە سۆز، یەک سووسەی بەسە
تا هەڵگرسێتۆو، سوور بێتۆ
بۆ سووتانت بگەشێتۆ



هەرچی بەدەوریا بێ خێرا
گرێی داو نابوود بێ و بڕوا
بیدەرە بەر بیرو ئاوەز
چاک بیپێوە گەز و نیوگەز
کۆتایە هەر بیرو ڕایێ
لەگەڵ مەنتیقدا پێکنایێ

***

چی بکا کە لێی ناوەشێتۆ
چاک بێ و بی جێ نەدا پێتۆ
خدێی خۆی چون لە بیر چێتۆ
چاوەڕێی چاکبوونی مەکە
دەغەڵ لاواندن بێ کەڵکە
مارت دی سەری پانۆکە
هەوڵی لینی بوونی مەدە
چونکە پێم وتی زۆر مەحاڵە
گەوهەر بگرێ گاڵە تاڵە
چاکی بیمارێ چاکۆکە
ڕێگای ڕێبوارێ پاکۆکە
چاری بکرێ و یەخەت نەگرێ
ساختەچی گۆلاویان دەوێ
لە گۆما خوێناویان دەوێ
ئەگەر تاوێ پەکیان کەوێ
کڕ هەڵبێن و هیچیان نەوێ
ئامانەتە و هەلیان ئەوێ
ماتە تاکو دەستی کەوێ

وا هەو کاتۆ بۆ گورز و قاو
دیسان بەرەو گۆمی خوێناو
بە تاو چۆن چوو دێتۆ بە تاو

***

بەشکەم بڕواتۆ ناو گۆلاو
خۆی هەلکێشێتۆ لە خوێناو
خوێنی ڕژاوی گەنج و لاو
تا بەڵکو ماندوویبی دەرچێ
لە تەعزیەی پێشووی دەرێ
خوێنمژی وا لە زاتیدا
بۆ یەک قەترەی شێت و شەیدا
لە خوێن خواردن قەت تێر نابێ
هاوەڵی ئەبێ وریا بێ



**پەنگیاو**

ناڵەو هاواری شەوەزەنگ
شەوگار زرنگابێتۆ درەنگ
ڕەنجووری داماوی دڵتەنگ
لە پانای هات و نەهاتۆ
لە جەرگەی هەراو مەزاتۆ
دێتە گوێی زەراڵ، ناهانا، ناهاڵ
دەنگێ، دەنگی کێ پەککەوتوو
داماوێکی لەنگ و ماندوو ناڵەناڵ
خەستە و درەنگ و شەوەزەنگ
تێدەکۆشێ، سەرسەختانە
بەڵکو دەرچێ لە تەنگانە
هاواریشی بە کەس ناگا
دادو قاڵی کارێ ناکا
زیانێ لە دۆستێ نادا
هانا بۆ نامەردیش نابا

***

ڕقی دەروونی شەڕفرۆش
لەپڕ هەڵدەستێ دێتە جۆش
هەوڵ و بزڕکاوو پەرۆش
سەرلێشێواوی بێبڕەس
بیماری بێحەیا و تەرەس
ڕادەداتێ پەستی ناکەس
دەڵێ: نابێ پەنگاوی سەنگ

دەرچێ لە چنگاڵی پڵەنگ
ڕەوایە تا ئاخر نەفەس
سزا بچێژێ تاکو هەس
پێویستە پارە پارە بێ
بڕوات، لەبیرچێ، بۆ هەبێ
بیروبڕوای پەست ئاوایە
بە ڕاستی کایەیە، کایە
چەتوون خۆی میرو مەڵڵایە

***

کەمتاری بەدخووی کۆنەساڵ
ئەبێ تاو بگرێ ناڵەناڵ
هانا بەرێ نزیک و دوور
تکا کا تاکو زەردو سوور
ماوە نەدەن بەو پەنگاوە
کە ڕێی هاتووچۆی بڕیاوە
ڕزگار ببێ لەو زووخاوە
مۆڵەت نەدرێ کە خۆی دەرکا
تەنگانەکەی چارەسەر کا
گەنجێ بنێتە سەر گەنجی
تەرەس بێوەر کا لە ڕەنجی
هەوری ڕەشی ژەنگاوی تار
جەهل و نەزانیی نابەکار
نەڕەویاوە بە تانە و عار
بەرچاوانی دەغەڵ تارە
حەق بەدی ناکا پەتیارە



وا تێناگا کە بیمارە
باری نالەباری لارە، نەزانی شێتی بێچارە

***

نایزانی ئێستا، کاتێکە
بە خەرج ناچێ تێکەولێکە
خەڵک ئێستا پێبەندی نەزمە
دێمۆرە بووەتۆ ئەو بەزمە
ناتوانێ ژەندەرمەو گەزمە
بە زۆری سەرنێزە و چەکمە
کورد دانێ بە تورکی وەحشی
سیاسەت گێرێکێ ناشی
یا بڵێ جیننیی کەژانە
یا مێدی و فارسی ئێرانە
ئەوانە ئاوەز بەتاڵن
وا لەخۆیانۆ ئەیاڵن
بێ ویجدانن، ئێسک تاڵن
هەرکەس ئەمرێ بۆ خۆی کەسە
زۆر سەیرە بێژی ناکەسە
هەر گەلێ بۆ خۆی گەلێکە، هەر کەسێ بۆ خۆی کەسێکە
هەر جۆرە تەیرێ، مەلێکە
هەڵۆ نابێ بە حوبارا، ئەم لە دەشتا ئەو لە غارا
لانەی (شاهین) کوا لە دارا، وردی شیرینە لە کارا
ئەوانە گشتیان باڵدارن
هیی چیا یا هیی ناودارن
دەبێ بژین و بسرەون





هێلانەیان بێ و داکەون
هێلکە هەڵێنن، بخوێنن
نابێ ژینیان لێ شێوێنن
بێخود دەردیان بدێوێنن
ئەم گوڵگەشتی کردگارە
لانەی تەواوی گیاندارە
هیی زەنگین و هیی هەژارە
هەر کەس بەپێی بەش و بارە
لەم دونیایە بەرخوردارە
نابێ لێی بکرێ ئاوارە
بە مەیلی شێت و پەتیارە
ئەگەر تۆ جێی خەڵکیت بوێ
نەهێڵی بۆ خۆی بسرەوێ
کێ بێ ئەوەت لێ بژنەوێ
ژییانی ئەو خۆ تاڵ ئەکەی
رەنجێ، بێجێ و بەتاڵ ئەدەی
سەرسەری عەیبە سەهو ئەکەی
ئاسایشت لە دەست ئەدەی
سەرئەنجام هەر پەشیمانی
داکەوە! لای خۆت ئینسانی!



**هەوەس**

شەپۆڵی دەریای خرۆشان، گێژاوی هەوەس، تۆفان
تۆفانی شوومی ئارەزوو
بەرئەنگاری هێزی ئاوەز
بێپیشوو، بێ برەس، وەکوو هەرەس
دەسدرێژ و بێ ئەمان
چیی دەوێ، تەرەس؟!
ئەیەوێ، تەوانا، ئارام و رِام
لە راستەی بروا بترازێ
سەرئەنجام
تاکو بەلاّی بەسەر بێنێ؟
بەشکە بیکاتە هاومالّی بەلاّ
شمشێری ستەمی بداتە دەست و جا
حەمایلّی چەتوونی لە ئەستۆی نێ
پەنجەی پۆلاّی لە پەنجە هەلّپێکێ
تا وەکو مەقەس
چاکی چاکەی پێ بقرتێنێ
ریشەی بەزەیی لە مەزرای دەروونی دەرێنێ
سەر ئەنجام بیتەزێنێ
بیرووخێنێ
لەسەر بارووی کەرامەت دایبەزێنێ
دایگرێ، بیخنکێنێ، بیبەزێنێ
ئامیانی نامەردیی تێدا هەلّجوێنێ
(حظ اللعین)ی بلاوێنێ

تا کەس بکاتە ناکەس و ناکەس بە کەس
هەرەسی ئارەزوو بخاتە ڕێ
دەسەوناو لافاو بە تاو
تاش و تلی هەوراز و پلوپووشی نشێو
دەسەوناو هەڵتلێنێ
بە قوڕاوی دەربەندی ناهەموارییەوە
هەمووی پێکەوە بڕفێنێ و بێنێ
تا چی و بۆ چی؟
ماڵی هەژار و ناتەوان بشێوێنێ
تەرمی زانین لە گۆڕی تەنگوتار نێ؟
تا فریشتەی ڕزگاریی بفەوتێنێ
ئەوی کە نەمەشیا بقەومێ، بقەومێنێ
بەشکەم کۆشکی مەینەت ئاوەدان
دۆزەخی هەناسەساردان فراوان
دووکانی ستەم پیشەکان
جەنجاڵ و قاڵ بێ
پڕ موشتەری، کڕیاری مەتا
تا بەڵای گران، بدا بە هەرزان
چاوی سوور کا نەزان
بە کەیفی خۆی بیڕانێ
کەس پێی نەڵێ نازانێ
دونیا وێران و خەڵکی هەراسان

***

جا غوولی نەزانی هەڵپەڕێتە کۆڵی ئاوەز
لێی ببڕی بوارو ڕەوەز



تا ببەزێ نەبەز
ئەوەتا سەرئەنجامی هەڵەچوون
پەیڕەوی هەوەس بوون
بە خۆ خەڕە بوون
ئەوەتا لە ڕووی ئارەزوو دەوین
بێ تەگبیر لە باری گران نەوین
ئەوەتا سەرەتای بەزینی ژین
لە هەواری مەینەتا تەزین
لە شوێنی سەخڵەتا
لە کاروانی تەمەنی پڕهەڵەتا
بێ جێ بارخستن و بەزین

***

هەر شەپۆل و هەر کشانەوە
هەر هاژەو هەر جووانەوە
سەرئەنجام و ئاکامی ئەوێ
ئاکام، ئاکام
ئەی زلە، ئەی زلەی ئاوەز چکۆلە!
چیت وەدەس کەوت؟
خۆت دایە بەر ئەو شەپۆڵە، حۆلە!
بەر ئاوردت کردبوو
ئەتزانی کام کاوو کەمەر
بەرئەنگاری شەپۆلی ناهەموار دەوەستێ
لەکوێ پراش پراش دەبێ و دوایی دێ
هێز و تەکانی لێ ئەبڕێ؟
ئەو شەپۆلی دەریای هەوەسە

ناپایەدارە ئاخری چیی بەسەردێ
چیی لێ دێ، دەبێ تەواو بێ مەگەر نە
بەرەو کام کاو بەتاو ئەبێ بچێ
لە کام وەزەنەوە داپەڕێ
تا پراش پراش دەبێ
تیا دەچێ دەمرێ، دەمرێ



## سەبر کە

سەبر کەن تا شەوگاری تار بزرنگێتەوە
بەردەتل بووەستێتەوە
تاوێر بەرنەبێتەوە
شۆڕاوە، بنیشێتەوە
لەحیمی نوقرەسانی زوقمی کوێستان
بیبەستێتەوە
بووکی شەفەق بە تریفەی ئەستێرە بشنێتەوە
زەنگیانەی گەردەنبەندی
بۆ سەرکەشان و ماوەشان
شیک و جوان بە کەیفی خۆی
بچنێتەوە
تەزبێحی مرواریی ملوێنکی بابانوئێلی بۆ خدری زیندوو
ورد ورد بهۆنێتەوە

***

سەبر کەن تا دێوی تاریکی بەتاو
لە ناوی تریفەی مانگەشەو تاراو
بچێتەوە پشت کێوی پەڕاو
خۆی بشارێتەوە
کونەمشکی لێ ببێتە عومارەت
دەم لەسەر پشت لە ترسی تاوی هەتاو
بگوێزێتەوە و گوڕی گومکا و بۆی دەرچێ

***

سەبر کەن تا بە هەناسەی دەروونی کێو
نەوباوەی ژێری گەردەی خاک

گەرمی ببێتەوەو لە خەو هەستێ
بە نازەوە و بێباک، چووزە بترەکێنێ
سەردەربێنێ، عیشوە بنوێنێ
ئەمجا ئارایشگەری بەهاری
بە حەوت قەڵەم ئارایشی تەتاری
دەسداتە ئارایشی دیمەنی نیگاری
ملوێنکی بووکی کردگاری
لە دانەی ئەشک و ئەسرینی ئاوداری
بهۆنێتەوە قەتار قەتارو ڕەنگاوڕەنگ
بیڕازێنێتەوە
***
سەبر کەن تا قافڵە سالاری سەر دیاری بەهار
لە مەڵبەندی زستان بێتەوە
خواجە بازرگان بگاتە پێشەوە
بارخانەی شەقایق و نەستەرەن
شیرهەراڵ و سۆسەن و سیسەن
خەرمەن خەرمەن
مەتای تەرچکی لاشەتاوو، بەروەزەن
لە کاروانسەرای ئەوین و خۆشەویستیی داخا
سەرلەنوێ بۆنی سوورهەراڵەو وەرکەمەر
لە گوزەردا بدا لە دەماخ
جا بە دەماخی چاخ
***
بلێن و ببینن
سەبر کەن تا کاتی خۆی



تا ئەو کاتەی کە شەنگوول دەبم
ئەوسا بمدوێنن و لێم بپرسن
تا بێپەردە پێتان بڵێم جوانی
لە کوێ چاوەڕێ کەن
گوڵی ڕەنگینی ژین
لالەیی سووری زەریفی ئاورین
لەکوێ جێبەجێ کەن
شاقەلی ئەرژەنگی نەهات
چۆن ببڕن و نەنگی بۆ هەمیشە بسڕن
جا لێتان ڕوون دەکەمەوە
بۆتان لێکئەدەمەوە
چی بە هەرزان بدەن
وە چی بە گرانیش بکڕن؟ ئازادی، ئازادی
چی بەخۆڕاییش مەسێنن و نەتانەوێ کوێلەیی، کوێلەیی
کاروانی ژین بەرودوایە، هەروا بووە و وایە
بەڕێوەیە، ناوەستێ دێت و دەڕوا
بتەوێ یا نا
ئەمڕۆ من و سۆزی تۆ
مەڵێ چون، بۆ بۆ
هەر چۆنێ بووە هەر ئەڕوا، بڕوات هەبێ بڕوا
هەر ئەڕوا، هەر ئەڕوا
جاویدان نیت، ئەمانەتی
پێت ئەڵێم ڕووت و پەتی
ئەوی گرنگە بتبێ، ئازادییە، ئازادی، ئازادی
پیاوانە بژی ئەگەر ئەژیی

به مەینەتە کەی ئەژیی
تەنیا مەژی!
لە منت کەوتبێ، ئەژیی بە ئازادی بژی
ئەگەرنا نەتەوێ، نەتەوێ بژی



## بۆسنا و هەرسەک

ئادەمیزاد! ئاوەز بچووک!
ئیددیعا گەورە! کەللە پووک!
تا کەی هەر وا هەڵەو مەنگی
تا کەی شەنگوولی، دڵ سەنگی؟!
هەڵدەسووڕێی، وێنەی بەنگی
بێ بەزەیی و نەزەر تەنگی
هێمان بێ بڕوا، هیچوپووچ
هەر تامەزرۆی تاوان و سووچ
هێمان نەهاتوویتە سەرخۆ
هێمان وێرانین من و تۆ
زۆرمان ماوە بینە ئینسان
بەڕاستی نادانین، نادان
لەبەرچی؟ بۆ!؟
هێمان بەنیادەمی بێهۆش
زۆرن هەرزەو عەلەکی خۆش
بەڵام بیمار، لاکین نەخۆش

***

چەن پەیامبەر بەداختەوە
هات و ڕۆیی و سەری ناوە
ئەو گشتە فەیلەسووفانە
ئەو هەموو پەندنویسانە
بۆ کارێکی نەکردە تۆ
ڕەنجت بێوەر بێ، ڕەنجەڕۆ

پێم ناڵێی، زاڵم! بۆ چیت تۆ؟!

لە بەر پێی کاروانی ڕێتا

بە چوار دەوری دەس و پێتا

چەن چراو شۆڵە هەڵکرا

چەن فانۆسی ڕوون داگیرسا ؟

چەن ڕەنجی  فەرهادی درا ؟

بەشکەم تەمەننای سەرکێشت

شەڕی خۆی نەخاتە پێشت

بەرەو چۆڵی هەڵەت نەتبا

تیاتا نەبا و پەکت نەخا

چییان پێت نەوت شوعەرا ؟

کام ڕێیان نەگرت عورەفا ؟

بەرت بۆ هیچ کەس نەگیرا

پەڕەی پەڕاوی یەزدانی

سروودی جوانی ئاسمانی

ڕێنومایانی سوبحانی

چییان هێشتۆ ڕانمایان

شێرەمەردانی بائیمان

سەرکێش، داچڵەکێ ئەی ئینسان؟!

سەرئەنجامی هەمووی هەموو

پێم بڵێ وا بیستت چ بوو ؟

بە چی دەرچوو، بە فیرۆ چوو ؟

***

دەسدرێژی بۆ سەر عەرەب

ئازادە بۆ تۆ ئەی جەڵەب



ڕەشکوژیان بە تیری چەرموو

کوشتنی ئیسلام و هیندوو

مەکە تا کەی بەس بێ جادوو

شاکاری (هەرسەک) و (بۆسنا)

کوشتنی پیری تا بوڕنا

بڕینی بێنەوا و ساوا

ڕفاندنی ئافرەتان بە زۆر

کوشتن، بڕین، زامی ناسۆر

سزای بێڕادە و جۆراوجۆر

نامووس بردن کچی عەزرا

دژی موسوڵمانی دونیا

ئەوەتا دەعیەی ئەورووپا ؟

دەبێ نامووسی خۆی ببا

سەری خوشکانی خۆ داخا

هی (هەرسەکی) لە ئەورووپا

هەر بۆ ئەوە موسوڵمانە

ئەوە ئایین یا ویجدانە ؟

ئەوە ڕەوشتی ئینسانە ؟!

کام دین ئیجازەی دای، (مەسیح) ؟

دا پێم بڵێ ڕووت و فەسیح

یا مەریەمی پاکی عەزرا

ئەو فەتوایەی بۆ ئێوە دا

یا تەمەددون چەرخی فەزا

ئەو ئیجازەی بە ئێوە دا

خەڵکی ئەبەن بۆ کام مەکتەب؟

بۆ کام دین، کام فەرهەنگ، کام ئەدەب
ئەوندە پاک و بێ عەیبە

***

ئەوەتا تۆو، ئەوا مێژوو
ڕاستی بڵێم حەیاتان چوو
کەی هێند ستەم ئازاد بوو زوو؟
ڕووت پێت ئەڵێم شەرمەزاری
ستەمگەری، ناهەمواری
(هەرسەکی)، ئامۆزای خۆتە
(بۆسنایی) هەر خودی خۆتە
ڕووت سپی ئەو چەرموو، ڕوویە
سپی پێستە و تەڵا موویە
نە تەمەددوون، نە دین، ئایین
نە فەلسەفە و عیلم و زانین
بۆی نەکریا چاری تۆ کا
خووی خوێنخواریت لە سەر دەرکا
ئەوی ئەیلێی بە دەم کوانێ!؟
ئەوی نووسیت خەڵک بیزانێ
خۆت بۆ نەتکرد، کوانێ، کوانێ؟!
گشت ئەوانە ئیدیعایە
خۆهەڵکێشانە، بیجایە
هێمان، بەنیادەم، خوێنخواری!
هێمان، بە ئەروا غەدداری
ڕازی دەروون دائەشاری
خۆت لە خدێی خۆت بێزاری





مەعلوومە چاری خۆت ناکەی
پەنا بۆ نەیرەنگ، بۆ فێڵ ئەبەی
چاری نایێ بۆت، هەژاری
دەروونت جۆش ئەخوا، ژاری
لەمەڕ نەفست گرفتاری
بێجێیە دەعوای هوشیاری
بەرچاو تەنگی، دیدە تاری، نەخۆشی، زاری، بیماری
ستەم پیشەیت و خوێنخواری
هەرتا زووە فریا کەوە
چارێکی خۆت کە و بسرەوە
واز لە ئیدیعای زل بێنە
لەسەر بەرەی خۆت داکەوە

**له دوای نیوەشەو**

شەوەزەنگێ دەمەوبەیان
خەوم شێوا، ئارامم چوو
بێ وەقرە، بێ پشوو، ماندووی ماندوو
خەستە و کەنەفت و ناتەوان
بێزار لە چەرخانی زەمان
دەورم کردۆ تۆماری زوو
سەر هەتا پای ئەوی چووبوو
غەیری حەسرەت چیی دی نەبوو
ئێستاکەشم غەم و وەرهەم
یەک لە شوێن یەک، ماتەم، ماتەم
باری مەینەت، مەکۆگای خەم
زامی ناسۆری بێ مەرهەم

***

هەستام و فانۆسم هەڵکرد
بێ پەروا، کاتێ دەستم برد
پێنووسی دەم تەڕم هاورد
ناوێکی یەزدانم لێ برد
جا تۆفانی ئەم دەروونەم
ئەو هاوار و چەنوچوونەم
کە بۆتە بایسی خەوم
ڕێم نادا کەمێ بسرەوم
شیوەنگای کۆن، جەمگای نەوم
تا ڕادەبێ بە پێنووسم
لەسەر کاغەزێ بنووسم



بەڵام ئەمویست ئاورین بێ
مەحکەم و قورس و مەتین بێ
پیشانگەم مەینەتی ژین بێ

***

وا بەم چەشنە دەسم پێ کرد
بە یادگار، بۆ ڕۆڵەی کورد
ئەگەرچی تابلۆی حاڵەتە
(وصف الحال)ی هەر میللەتە
شەرحی جەفای خەجاڵەتە
بەڵام ئاوێنەیە، جامە
نوێنگای هەر زووخ و زامە
جامێ ستەمگەر ئەنوێنێ
حاڵی مەزڵووم ئەفامێنێ
کە خەڵک لە ڕاز تێگەیێنێ
جۆیاسەری لێ دەربێنێ
ئەیخاتە ڕوو لە پێش چاوت
ژینی پڕ ژان و سووتاوت
لێت دەخوازی کە ڕاچەنی
پێت ئەڵێ گیرۆدەی پەنی
دە وریا بە، ئەگەر ڕەنی!
لە کام هۆزی لە کام گەلی
خەڵکی کام دۆڵ و کام پەلی
هەرچی کە هەی، بەنیادەمی
وەک من گیرۆدەی ستەمی، شکم نییە یاری خەمی
ئەنباری ژان و وەرهەمی

***





گوێ بگرە ئێستا سکاڵام
مانیاوی سەر هە تا پا زام
دەردی ئێستام و کۆنەزام
ئەنبارە گشتی وا لە لام
ئەوە هیچ، چوو، ئێستا تەگبیر
ناڵەی تۆپ و قلەی شەستیر
مەترەلۆزی زلەی بێ پییر
گرمەی بۆمباو ئاگرباران
زیرەی سارووخی بێ ئەمان
بۆ ناو کورکەی ژن و خێزان
هارەی تەیارەو مووشەکی
یەک لەدوای یەک سێجرتەکی
هێلیێکۆپتەر، مووشەک ئەنداز
تەپودووی کیمیاوی، هیی گاز
زیرەی برنەو
گوللەی وەرشەو
شمقارسان، بازووکا بەدەو
بۆ ناو کورکەی ساوای کوردان
بەزەییی چی؟ کوانێ ئیمان؟ لە کوێ ویجدانە، بێ ویجدان
تالاَن کردن، ماڵ ڕماندن
وێرانگەری و سەر شێواندن
بێ پەروا هەمووی سووتاندن
ئەویش هیی کێ؟ هیی کورد هیی موسوڵمان
لەخواترس و خاوەن ئیمان
پەیڕەوی ئەحکامی قورئان
کێ؟! ئەوەی شەنگی سەندیتۆ



خۆی دا بە قیسپا لەسەر تۆ
دەک داوەشێی برۆ... برۆ...
شەرمی پێ دەوێ، نیتە تۆ
ئایین باشە، لێی مەحروومی
بەڕاستی گیانداری شوومی
تامەزرۆی هەندێ کەلاوەی
بەسەربا شین و زاری کەی

***

گەلی کورد پشتیوانت بوو
هاودین و هاوئیمانت بوو
هاوسەنگەرو پەیمانت بوو
لە ماڵ خۆیا میوانت بوو
هێندە کەم خۆی دا بە چاوۆ
هەر هەڵەت کرد پاسای داوۆ
واتئەزانی هیچوپووچە
بەدنمەکی عەیب و سووچە
حەقی بخوێ، میوانی بی
مێردەزمەی سەرشانی بی
مۆتەی ناوی خێزانی بی
ماڵ و داراییی بە فیرۆ
لەخۆڕاییی بدا بە تۆ
ڕاستی، میوانێکی پڕ ڕووی
یارێکی بە دڵ و بەدخووی
هەڵیلووشی شیرەی گیانی؟!
ئەوە لای خۆت تۆ میوانی؟!

***

نەوتی کەرکووک و خانەقین
میوەی هەورامان و بادین
مەعادینی زۆرو بێ پەی
دەربیبێنی و گشتی ببەی
تووتنی دەشتی شارەزوور
پەمووی بێ وێنەی باوەنوور
بێتە بەردەستت بێمزوور
قەندەهاریی دەشتی گەرمێن
لە حەمرینۆ هەتا بەڕوێن
لە کەرکووک تاکو میراجی
برنجی مالوان و ساوجی
چەڵتووک دەلێن و گوێی سیروان
نیعمەتی کوێیە، بێ ویجدان!
نمەک گیر بی چەن بێ جێیە!
بلێیی وەڵات موڵکی منە
کورد هەر هیچەو بەچکەی جنە
کوردستان بێ خانەخوێیە
ئەوی وا ئەیلێ بێ جێیە
گوێی مەدەنێ کوێلەی منە
چون هەژار حەقی مردنە
بیکوژن، نەمانی باشە
مانەوەی موشکیل تەراشە
دونیای بێوەفای چەواشە
هەر ئەو کاسە و هەر ئەو ئاشە
ئەمە تابلۆی ڕۆژگارە



ژیانی گەلی هەژارە
ستەمگەر، لەکوێ بوایە
چوار زەربی دوتا دوتایە
هێمان بەشەر وەحشی و شوومە
هێمان وێرانەخوازە، بوومە
سەیری سەراسەر دونیا کە
هەر هەژاری سینە چاکە
ستەمگەر ئاغایە و تێرە
موعتاد بە خوێنخواری فێرە
کوا ئەو ویجدانە لێی ئەدون
برام! گشتی فڕو فێڵە
هێمان ئینسان بەرچاو لێڵە
نە فەلسەفە و دین و ئایین
نە ڕانمای ژیری پێشین
نە حیکمەت و پەندی مەتین
نەیتوانی چاری بەشەر کا
ڕوونی کاتۆ تا ڕێ دەرگا
هێمان وێڵی تاریکسانە
بەرچاوی تەنگە و نەزانە
خووی خۆخۆریی تیا پەنهانە
بە لای خۆیشیەوە ئینسانە

## وشک هەڵمەیێ

وشک هەڵمەیێ لە ترسی کەس، مەبڕە لە ژێردەستان بڕەس

مادام زیندووی سەرجوێن بە

بەرەنگاری خۆ نوێن بە

مەترسێ لەو قرم و قاڵە

هیچێ نییە غەیری گاڵە

ئەوی وا ئەیلێ بەتاڵە

بەسەر مەزڵوومان‌دا زاڵە

ناوچاوت لێ هاوردە یەک

بڕوانە بۆی، پەکیەتی، پەک

دەم هار، هەردەم هاریی لێ دێ

مەردانەگی لێ ناخێزێ

هۆشیاری ئەندامی مەن بە!

کاتێ کە ماتی دا لە خۆی

سەری داخست و خێرا، ڕۆی

با هیچ نەڵێ، لێی بترسە

بێ مەلامەت ناڕوا، خرسە

هیچی لێ نایێ کەللەشەق

بێجگە لە قیڕە و قسەی ڕەق

بەڵام مۆنی خرسی بێ دەنگ

کۆلێکردنی ڕەوایە، داگرسێ یەکجار بەڵایە

بێشک سەودای لەسەردایە

ئەیەوێ بەجێیی بگا

هەر جۆر بووە کارێ بکا



بۆیە بەوجۆرە بێدەنگە

سەنگین ئەڵێی سیاسەنگە

بابە ڕواڵەت ئارامە

بێگومان دەروونی زامە

ناکامە و چاوەڕێی کامە

بڕوا بۆ گۆمی ئاوی مەنگ

چەن ئارام و مات و بێدەنگ

کێ ئەزانێ کە چەن قووڵە

ئاوێ ئاوی و دەوری تووڵە

بەڵام چۆمی خوڕ دییارە

بەردە و خاکە و بەرەوخوارە

قەڵوەز لەسەر یەک قەتارە

ئەکشێ ئەڵێی ئەژدەهایە

دەزانی چیی لە سەردایە

ئەم دونیا گشتی هەر وایە

بەڕاستی کایەیە، کایە

کەی دوایی دێ ئەم هەڵڵایە؟!

بێ مایە، بێ مایە، بێ مایە، دەربەس مەبە بەکەڵک نایە

هیچێ تا سەر دەوام ناکا

ئامان! پشتی پێ مەبەستن

پێچەوانەشی مەوەستن

نەهات دەردێکی گرانە

خۆت بە تەوانا مەزانە

دەستەڵاتت ڕادەی هەیە

لە ڕادە دەرچوون، هەر وەیە

نە هێندە شیرین بە بتخۆن
نە نەرمێ بە بەوەک مۆم و ڕۆن
نە تاڵێ بە تفت کەنۆ
وشک هەڵمەیێ لەپێستتدا
قایم بە لەهەڵوێستتدا
نابەڵەد خۆت مەکوتە ناو کار
تا خەڵکی لێت نەبن بێزار



## بەشی خۆم بۆ خۆم، لەگەڵیشتا ئەخۆم

ئەو هەوایە گەلێ سەیرە کە بێگانە ئەڵێ: ئەبێ تێکەڵ ئەوی ماڵی تۆیە، لەگەڵ ماڵی منا ئەمجا بیهێنە هەر چێکت پێیە، لەگەڵ چیی منە هەردووکی سەرجەم ئاوێتە... چیت هەیە، بێ تۆ، کە من هەم تۆ چییە پێی ناوێ ئەمجا من و تۆ، بەسە تۆ تۆی چی کە من هەم بێ جێیە من و تۆ بەسە تۆ تۆ چییە، من من چییە هەر بێ مەعنایە من و تۆ بەسە، تۆ تۆی چی کە من بم وریا بە نەڵێی بۆ وایە و دیارە کە منیش هەم لەویا کە منم من بەسە پێی ناوێ منیش هەم هەم وریا بە ئەوی بکرێ، بە بێ ئیزن و ئیجازەم مەمنووعە خەتایە، نەئەبوو بکرێ بە بێ من سەردارم، ئەمیرم، دەبێ پێت وابێ منم من مەمنووعە بەتەنیا لەپی لێ دەی ئەوی هەتبێ پێویستە بەشی من، لەوەشا هەر کەڵە بەش بێ هیی خۆمە ئەوی بمبێ بەتەنیا لەپی لێ دەم هیی تۆش بەشی منی تیا، کە بەجێیە کوڕە ها خۆ بەشی تۆ، من و تۆ، پێکەوە بڕیارە کە بخورێ بەشی من چ زەمانێ بمەوێ، خۆم ئەبێ بیخۆم ئەمە یاسای (قەومییە) نەشکێ بە ئاسان بورجێکە بوڵەندو بارووی کۆن، مەحکەمە، مەحکەم





## نەورۆز

ئەم بەستەیەم لەسەر داخوازیی موهەندیس کاک (هادی جەلالی) هۆندەوە، ناردم بۆی بۆ شاری (واشنتۆن) لە ئەمریکا تاوەکو بیخوێنێ، ئیتر نازانم خوێندوویەتی یانا.

نەورۆزە، نەورۆزە، سبەینێ نەورۆزە
گەلی کورد پیرۆزە، جێژنەکەی هەر سۆزە
لاوی مە دڵسۆزە، ئازادەیی هۆزە
هەر ڕۆژی نەورۆزە، جێژنی لێ پیرۆزە

***

گەنج و لاو وریایە، سەربەستەو ئازایە
نەورۆزی غەوغایە، سەودای دڵ ئەفرۆزە
ڕۆژێکی پیرۆزە، بۆ هەر کە دڵسۆزە
نەورۆزی نەورۆزە، جێژنەکەی پیرۆزە

***

کوێستانی سەربەرزە،دەشتی هەزار تەرزە
گیانبازی بۆی فەرزە، نیشتمانی هۆزە
نەورۆزە، نەورۆزە، کچ زڵفی ئاڵۆزە
شادیی کوری قۆزە، دوژمنی ئاڵۆزە

***

زەڕڕین و نەخشینە، ئافرەتی ڕەنگینە
خوێن گەرمە، شیرینە، دڵسۆزە، دڵسۆزە
ڕەشبەڵەک گیراوە، سەمای گەنج و لاوە
زاخاوی دوو چاوە، ئاهەنگی پڕ سۆزە

***



نەورۆزە، نەورۆزی، داکی کوری هۆزە
شۆڕشگێڕە و شێرە، چالاکە، زۆر قۆزە
دڵ براو سەرمەستە، هەژار چیی بەدەستە
سەرخۆش و سەرمەستی، شادیی گەل و هۆزە

***

خوایە! وەتەن جوانە، یەک پارچە ڕێزوانە
ئەژێ، جاویدانە، گشت ڕۆژی نەورۆزە
نەورۆزە،، نەورۆزە سبەینێ نەورۆزە
گەلی کورد پیرۆزە، جێژنەکەی هەر سۆزە

## دونیای بێ بەقا

ئەم بەستەیەشم دیسانەوە بۆ کاک هادی جەلالی هۆندەوە کە لە شاری واشنتۆنی ئەمریکاوە لێی داواکردم، هۆندمەوە و بۆم نارد. ئاهەنگەکە لە ئەسڵدا هیی کرمانجە، منیش سەربەستەکەیم وەک خۆی هێشتەوە.

ئەهای، ئەهای[١] لە دونیایێ
چ دونیایێ بێ وەفایێ!
ژینێ کە چوو ئیدی نایێ
چ چاوباشقەڵ، چ ڕەعنایێ
چ مەککارێ، چ غەوغایێ
چ پیلانگێڕ، چ بێ ڕایێ

***

سەرێ پڕ بێ لە سەودایێ
تا لەت نەبێ بە مەودایێ
شەیدایە، تەسکینی نایێ
بریندار چۆن دەنگی نایێ
جگەر دەبڕێ نەوای نایێ
تین و بینی بێ پەروایێ

***

بەڵێ دونیای بێ بەقایێ
گڕ ئەختاتۆو خۆی پێ نایێ
ئەهای، ئەهای، لە دونیایێ
عاشق ئەکوژێ بە مەودایێ
بە تیغی تیژ و بوڕڕایێ
ئەڵێ بۆ چاک ناڵەی نایێ

***



ئای بۆ سەرێ، پڕ سەودایێ
ئای بۆ دەروونێ، ئاگایێ
جاڕ بدا جەوری دونیایێ
عاشق کوژی دوایی نایێ
کاش سادەی بۆ نەخڵەتایێ
تا ئارامم بگرتایێ

***

دی هەژاری نەپیکایێ
ئەهای، ئەهای لە دونیایێ
خوێن ڕشتنی دوایی نایێ
ئای (ریسوایە) چ ریسوایێ
بازیگەرە و چاری نایێ
بکەن ئادەم و حەووایێ

---

١- ئەهای: های.

## دەنگ دێ لە شیلانەکەی

چاوت ڕەشە بە خومارەوە
مەمکت سێوە بە دارەوە
هاتۆتەبەر لە پارەوە
خودا داویە، مەیشارەوە

***

جوانە، با زاخاوی چاو بێ
پەرژینی هەر زڵفی خاو بێ
ئەگریجە سایەی، هەتاو بێ
تۆپی گوڵت نەشەمزاو بێ

***

لەناو لەعلا مرواری بێ
بزەت کوانێ؟ با دیاری بێ
نەشئەبەخشی دڵداری بێ
دەرمانی دەردی کاری بێ

***

بۆ دڵنەوایی ڕێ کەوە
ڕەوتت دەڵێی ڕەوتی کەوە
عاشق! وەرە و دووی مەکەوە
لە سای سەودایا مەسرەوە

***

عاشق ئەبێ جانانە بێ
سەوداسەرو دێوانە بێ



ڕیسوایێ پڕ پەیمانە بێ
خاکی دەری مەیخانە بێ

***

عاشق لەکوێ بوو وا نەبێ؟
دەردی سەری گۆیا نەبێ
ناکام ئەوەی ڕیسوا نەبێ
کێ شێتە ئەر شەیدا نەبێ؟

## هەڵۆی شاهۆ

بڕوا بۆ باڵای بەرزی    ئەتوارو تەورو تەرزی
پێ کەوتنی بێ مەرزی    چۆن لە سامی نەلەرزی

***

تاساوم لە تا سەیا    داماوم لە ڕاسەیا
بوێ فریشتان دەبیسرێ    لە هینای هەناسەیا

***

ئای لە چاوی خوماری    ئای لە دەس لەنجەولاری!
ئای لە نازی نازداری    ئای لە پەلکەی ڕەشماری

***

ئای لە ئاشتی و تۆرانی    چیی پێ بڵێی نازانی
وەی لە سۆزی زامانی    تیرئەندازی و پەیکانی

***

کە چوو بەرەو باوانی    ئەمخاتە سەرگەردانی
سەختە دەردی هیجرانی    وا لەوێ ماڵوێرانی

***

ڕاستە عەهدو پەیمانی    ناشکێ وا بەئاسانی
دەک لەبەر نازی مرم    کیژە کوردی گۆرانی

***

تەواری سەر بەرزانە    شابازی سەر شاخانە
شاهێنی هەورامانە    هەڵۆی شاهۆ و تەڕلانە



## دە چی بکەم

### بۆ مەقامی ناوەڕاستی بەستە وێژراوە

دە چی بکەم وا لە بارمتەی ئەوینا چوو دڵی شەیدام
لە گێتیدا نەبوو وێنەی دڵی دێوانەیی ڕیسوام
دڵێک و لانەیی پۆلێ ئەوینی بێ سەر و سامان
دڵێ کوا ئەر نەگەوزابێ لە خوێنا بێ بەر و ئەنجام

***

### هەر ئەو سۆژەیەو لە چوار خشتەکییەکی ترا وتوومە

دڵێکم بو لە سەد لاوە لە بارمتەی ئەوینا چوو
عەجایب تر لەوە چی بکەم؟ لە هەستێ ئاورینا چوو
دڵێک و لانەیی پۆلێ ئەوینی بێ سەر و سامان
لە تافی جوانییا ڕۆیی، بەڵام حەیفێ کە هەروا چوو

بەداخەوە نازانم کامیان لە ناوەڕاستی کام بەستەدا خوێنراوە.

## نازەنین

فۆلکلۆر: سەید بزمارە لە ١٣٤١/٣/٢٨ی هـ ش خوێندی کە لە تاران سەید محەمەدی سەفایشیان پێ دەوت.

ئەچی بۆ کانی بەو لەنجەولارە
هەزارێ وەک من بۆت گرفتارە
ئەو کچە شەو میوانمانە
کوشتمی خاڵ دانە دانە
ئەو گوڵە دەزوورانمانە
تۆ لە من مەگرە بەهانە!

***

هەی داد هەی بێداد لەم گڕ، لەم تاوە
لەم گۆزە بە شان، ئاور بەلاوە
ئەو کچە شەو میوانمانە
کوشتمی خاڵ دانە دانە
ئەو گوڵە دەزوورانمانە
تۆ لە من مەگرە بەهانە!

***

دەم قەن، ددان قەن، گشت گیانت قەنە
مەمکوژە وە ناز بە زەردەخەنە!
ئەو کچە شەو میوانمانە
کوشتمی خاڵ دانە دانە
ئەو گوڵە دەزوورانمانە
تۆ لە من مەگرە بەهانە!

***



ئەو باڵا بەرزە لەوێ وێساوە
بە عەتر و عەبیر زڵفی دەق داوە
ئەو کچە شەو میوانمانە
کوشتمی خاڵ دانە دانە
ئەو گوڵە دەزوورانمانە
تۆ لە من مەگرە بەهانە!

***

لە کێ تۆراوی، بکێشم نازت
ڕۆح کەم بە قوربان دوو چاوی بازت
ئەو کچە شەو میوانمانە
کوشتمی خاڵ دانە دانە
ئەو گوڵە دەزوورانمانە
تۆ لە من مەگرە بەهانە!

***

ئەگەر مەیلەکەت بدەم بە کەسێ
دەس وە بارەگای ئیمام نەڕەسێ
ئەو کچە شەو میوانمانە
کوشتمی خاڵ دانە دانە
ئەو گوڵە دەزوورانمانە
تۆ لە من مەگرە بەهانە!

***





## کۆڵان بە کۆڵان

فۆلکلۆر، سەید بزمارە خوێندی

کۆڵان بە کۆڵان، جادە بە جادە
باریکێ خاڵ شین مەڕۆ، شەرم لێ لادە
گۆشەی شەدەکەت بەرەو خوار مەکە
دوو دڵ بە یەکجار گرفتار مەکە

***

کۆڵان بە کۆڵان، جادە بە جادە
باریکێ خاڵ شین مەڕۆ، شەرم لێ لادە
لە سەرڕا هاتی شەدەکەت مۆرە
یا یاری خۆمی یا زەینم کۆرە

***

کۆڵان بە کۆڵان، جادە بە جادە
باریکێ خاڵ شین مەڕۆ، شەرم لێ لادە
مەل وە قاژەقاژ، دۆس وە برجەوە
شەوگەردی خۆشە وە نارنجەوە

***

کۆڵان بە کۆڵان، جادە بە جادە
باریکێ خاڵ شین مەڕۆ، شەرم لێ لادە
چوار کەس لەم دونیا نەگەین وە موراد
لەیلا و مەجنوون، شیرین و فەرهاد

***

کۆڵان بە کۆڵان، جادە بە جادە
باریکێ خاڵ شین مەڕۆ، شەرم لێ لادە





قەد وە کەمەرەی کلیل زەڕەوە
ئەڵقەی زڵف وە بان گۆنای تەڕەوە

***

کۆڵان بە کۆڵان، جادە بە جادە
باریکێ خاڵ شین مەڕۆ، شەرم لێ لادە
قەد وە کەمەرەی پڕ قەرانەوە
لیمۆ بریکەی دێ لە کەتانەوە

***

کۆڵان بە کۆڵان، جادە بە جادە
باریکێ خاڵ شین، مەڕۆ، شەرم لێ لادە
ئێوە جەیرانگەل، ماواتان دەشتە
دیدەتان وە کلەی ئیلاهی ڕەشتە

***

کۆڵان بە کۆڵان جادە بە جادە
باریکێ خاڵ شین مەڕۆ، شەرم لێ لادە

## پەیمانی ئاشنایی

نازانم خوێنراوە یان نا ؟

کاتێ یاری خوێن شیرین    دوێنێ خۆی دا بە چاوۆ
بە لەنجەو لارەو عیشوە    بە غەمزەو بە ئیماوۆ

***

زانیم هەڵات لە ئاسۆ    ئەستێرەی بەختیاریم
بوڵەند پەروازە بەختی    هومای ئیقباڵی کاریم

***

لەسەر کۆشکۆ پەری ڕوو    زەردەخەنەی دەهاتێ
کەئەیدی لە مانگی ڕووی    چاو ناتروکێنم ساتێ

***

بە ترس و لەرزو ئەدەب    بەسەر سەلامم لێ کرد
بە ئیستیغنا و ئیماوۆ    سەرێکی هاوردو برد

***

لیمۆی هەڵدا و گرتیەوە    زۆر بە بێ ئیعتینایی
گەیاندی زۆر گرانە    پەیمانی ئاشنایی

***



## بۆ منت ناوێ

ئەم گۆرانییە زۆر کەس وتوویانە، بەتایبەت خوالێخۆشبوو (حەسەن زیرەک)یش وتوویەتی، داوای هۆنراوەیان بۆ ئەم بەستەیە لێ کردم، منیش ئەم بەستەیەم بەم چەشنە هۆندەوەو دام بە گۆرانی وێژانی بەشی کوردی

من هەر تۆم ببێ هیچی دیم ناوێ
لە دووریت ئازیز، ناسرەوم تاوێ
خۆشەویستیی تۆم لێ بوەتە داوێ
قەت لێت ناگەڕێم، قسەی پێ ناوێ
دەک نابینا بێ نەتبینێ چاوێ

***

کوانێ دیمەنێ وێنەی دیمەنت؟
کوا ئەڕوێ سەوزەی جوان وەک چیمەنت
بۆیە دڵ بۆتە جێ نشیمەنت
دەینی ئەوینی من بە گەردەنت
تەنیا تۆم ئەوێ، هیچی دیم ناوێ

***

عاشقی ئاوو خاک و هەواتم
بولبولی گۆیای بەزم و نەواتم
بەهەشتی جوانی ڕووی سەربساتم!
نیشتمانی جوان، قیبلەم، ئاواتم!
بێجگە لە سیمای تۆ هیچم ناوێ

***

یاری هاوخوێنی خۆمم خۆش ئەوێ
هەرکەس نایەوێ خوایە نەسرەوێ

هاونیشتمانم! ئەویە پێ ناوێ
بولبولی ئیرەم، گوڵی خۆم ئەوێ
دڵ چ دڵێکە یاری خۆی نەوێ

***

ئەزانی جوانی، گەشی، شیرینی؟
نازکی، نەرمی، تەڕی، ڕەنگینی
بە فیزی کاتێ وا خۆت ئەنوێنێ
لە زۆرزانیتە کەمتر ئەمدوێنی
ئاشکرای ناکەی چۆن منت ناوێ؟

***

خۆشەویستیی من لەگەڵ جوانیی تۆ
تێکەڵاو بووگن وێنەی تارو پۆ
جیا نابێتەوە، ئەر ئەپرسی تۆ
خۆت چاک ئەزانی عیشقی کۆنە و نۆ
تەنیا تۆم بەسەو هیچی دیم ناوێ



## بۆ سروود وێژراو نەخوێنرا

نیشتمان! نیشتمان! ئەی وەڵاتی جوان!
گەردو گوڵی بەیانت نەوای هەزادەستانت
قاسپەی کەوی کوێستانت ئێوارەو بەربەیانت

بێ وێنەیەو مومتازە
دەبەخشی عومری تازە
لە تەعریف بێنیازە
با هەر بژی وەڵاتم
تا بەدیدێ ئاواتم

***

نیشتمان! نیشتمان! ئەی وەڵاتی جوان!
بروکەی ئاوی ناو کانی تۆی سەوزەو مێرگوڵانی
سەد دڵ دەبێ حەیرانی ڕۆحم بێ بە قوربانی

گیان بەخشە، دڵنەوازە
سوبحی بەهاری تازە
ئەم گەلە سەرفەرازە
با هەر بژی وەڵاتم
تا بەدیدێ ئاواتم

***

نیشتمان! نیشتمان! ئەی بەهەشتی جوان
کاتی زەردەی ئێواران ئەدا لەلووتکەی کوێستان
زێڕی قاڵن سەرلووتکان با هەر بژی نیشتمان

پڕ شکۆ و سەرفەرازە
دڵ دەبا بێ ئەندازە
دیمەنێکی مومتازە
ئەو گەلەم سەرفەرازە
گەنج و لاوی سەربازە
با هەر بژی وەڵاتم
تا بەدیدێ ئاواتم

## خانمی خێڵان[1]

کوێ ئەچی چاوەکەمی
منیش لەگەڵ خۆت بەرە!
بۆ گەرمێن ئەچیتەوە
بەتەنیا بۆ، ئەسمەرە؟
من بەرە جەیرانەکەم
سەرخێڵی گۆرانەکەم
ئاریایی نیشانەکەم
گوڵبونی کوێستانەکەم
خۆشم ئەوێی دڵبەرێ
سەرتەڵی بابانەکەم
شۆڕە ژن زۆر بەنازی
خاتوونی خێڵانەکەم!

***

یار بە ناز هاتە دواوە
سەرخۆشم بەو هیواوە
کاتێ دێ دڵم ئەلەرزێ
ڕوانیی بۆم، بە ڕەزاوە
پێی وتم بۆ پێم ناڵێی
تۆ بۆ هەروا دەچی و دێی
ماتم بردۆ، نەمتوانی
دەردی دڵم بڵێم پێی
خۆشم ئەوێی دڵبەری من
سەرمەستی گۆرانەکەم



شۆڕە ژن زۆر بە نازی
شێرەژنی خێڵانەکەم

***

نیم نیگای مەستم دەکا
خزمینە مەنعم مەکەن
هاوخوێنمە خۆشم دەوێ
بۆچی تانەم لێ ئەدەن
خۆشیەوێم جەیرانەکەم
سەرخێڵی گۆرانەکەم
ئاریایی هاوشانەکەم
مەرهەم و دەرمانەکەم
خۆشمەوێی، یارەکەمی
سەروی گوڵزارەکەم
شۆڕەژن چەند بە نازی!
ئەی خانمی خێڵانەکەم!

---
١- نازانم خوێنراوە یا نا.

## ئارياييى خوێنگەرم

ئەمشەو سەرخۆش و شاد و مەسروورم
نە دەربەس تانەی نزیک نە دوورم
خەڵکێ چوزانێ من بۆچی شادم
دوورادوور نەشەی مەزەی حوزوورم
ئێستا لە بەندی دونیا ئازادم
چونکە لە سەودای عیشقا ئوستادم
کیژە کوردی وردیلەی جوان! بە عینوان!
سەھەن پەروەردەی ئازارە! کیژی جوان!
نەمامی جوانی باغچەکەی کوردستان!
ئاریایی و خوێنگەرم، خەڵکی ئێران!

***

بە پیاڵەی چاوی مەستت مەدهۆشم
پەیاپەی بادەی عیشقت ئەنۆشم
بە نیونیگای ناز مەستت سەرخۆشم
نیو نازت بە ناز جیهان نافرۆشم
بۆیە لە بەندی دونیا ئازادم
لە سەودای عیشقی پاکا ئوستادم
لەگەڵ بالا شەمشادم
پێکراوی پەریزادم
کیژە کوردی وردیلە و جوان
سەھەن پەروەردە، گوڵی کوێستان
نەمامی جوانی باغچەی بابان
ئاریایی و خوێنگەرم، خەڵکی ئێران



نەمامی جوانی باغچەی بابان
ئاریایی و خوێنگەرم، خەڵکی ئێران

***

شەرتە شەرابی خەڵکی حەرام کەم
هەر بە مەی خۆیی کامم خۆش کام کەم
پیاڵە لە دەستی خەڵکی نەسێنم
هەر بە پیاڵەی دۆس سەرمەستی ڕام کەم
بۆیە لە بەندی دونیا ئازادم
چونکە لە سەودای عیشقا ئوستادم
لەگەڵ بالا شەمشادم
پێکراوی پەریزادم
کیژە کوردی وردیلە و جوان
سەھەن پەروەردە، گوڵی کوێستان
نەمامی باغی باغچەی کوردان
ئاریایی و خوێن گەرم، خەڵکی ئێران
نەمامی باغی باغچەی کوردان
ئاریایی و خوێن گەرم، خەڵکی ئێران

---

ئەم بەستەیەم دوو جار وتووە، نازانم خوێنراوە یا نا و، ئەگەر خوێنراوە کامیان خوێنراوە؟





## بۆ منت ناوێ؟

بۆ منت ناوێ، بۆ منت ناوێ
خۆ من دوور لە یار زیندەگیم ناوێ
خۆشەویستیی تۆم لێ بووەتە داوێ
گیانە، سەر بە ناز! شەڕی پێ ناوێ
پێم بڵێ بۆچی تۆ منت ناوێ؟

***

من کە لەپێشا دڵبەستەی تۆبووم
وەک کەوی ماڵی بۆت دەستەمۆ بووم
بەخۆشەویستیی تۆ دەسخەڕۆ بووم
بە گیان و بە ڕۆح دڵبەستەی تۆ بووم
ئێستا پێم ناڵێی بۆ منت ناوێ؟

***

ئەزانی گیانە! گەشی، شیرینی
نازکی، نەرمی، تەڕی، ڕەنگینی
سەرمەست و بێباک هەر خۆت ئەبینی
لە زۆر زانیتە کە ناماندوێنی
ئاشکرای ناکەی بۆ منت ناوێ؟
بزەی لێوت چی، ئەر ناپەسەندم؟
بە چاوت ئەڵێی ئارەزوومەندم
نەڵێی خۆڕایی دەرچوو لە بەندم
بایی ئەوینت دڵ بوو کە سەندم
ئیتر پێم ناڵێی بۆ منت ناوێ

***



خۆزگە لەپێشا بمزانیبایێ
کە ڕاست لەگەڵما نایەیتە کایە
خۆشەویستیی من لە دڵتۆ نایێ
تکات لێ ئەکەم تۆو ئەو خودایە
لە دەمت دەرچێ بۆ منت ناوێ؟
لەبەر تۆ خۆشیم ناوەتە لاوە
بە تیری نازت جەرگم بڕاوە
هۆشم وێنەی خۆم سەرلێشێواوە
لە دەس ئەوینت دڵم داماوە
بۆچی پێم ناڵێی بۆ منت ناوێ؟
خۆشەویستیی من لەگەڵ جوانیی تۆ
وا پێک ئالاوە وێنەی تاروپۆ
جوێ نابێتەوە ئیتر ئینکار بۆ
چاکت لەبیرە عەشقی کۆنەو نۆ
کەچی پێم ئەڵێی تۆ منت ناوێ؟

## بوتی کەنشت[1]

ئەمشەو مانگ هەڵات ڕووناک و خۆشڕەنگ
هەوا کشومات، ئارام و بێدەنگ
منیش چاوەڕێی یارێ، دڵدارێ
کیژۆڵە کوردێ، ئاسک ڕەفتارێ
ئاری نەژادێ، سەروی، ئازادێ
ئاهوو ڕەفتارێ، بالا شەمشادێ
پەری پەیکەرێ، فریشتەخوویێ
عەنبەرین زلفێ، زنجیرەی موویێ
دەس لە ژێر چەنە مات بۆی دانیشتم
تا بێتە جێ ژوان بوتی کەنشتم
لەناکاو هەڵات تاوی هەتاوێ
بوتێ مانگ ڕوویێ، ئەستێرە چاوێ
شوڵەی خستە ناو خێڵخانەی خەمم
غەمی دام بە با دۆستی هامدەمم
وتم بەخێر بێی ڕووناکیی چاوم
ئاواتی ژینم، جەرگ وهەناوم
هاوخوێن، هاونەژاد، هاودەم، هاودینم
پایەندازت بێ گیانی شیرینم

١- پێم وایە نەخوێنرابێ. نازانم کێ؟



## ئاواز

دو چاوم چاوەڕێی ڕێ بوو، وەرە ئەی یاری شیرینم!
کە ئەمشەو زۆر دڵم تەنگە، لە دووریت پەست و غەمگینم
بە تەنیا هێندە دانیشتم کە بەڵکو بێی و بتبینم
خەریک بوو شێت و دەیری بم لە دووریت، مایەیی ژینم
خۆش هاتی، سەربەنازم، شۆڕەژن، گیانم بەقوربانت
قەزات لێم، دڵبەرم هاتی، وەرە ئاواتی دێرینم!

## هاتەوە[1]

هاتەوە، بابێـــتـــەوە کـــیـــژێ لە ناو ڕانەوە
ئاوێتـــەی زلّفی شـــەو بۆ ســـەروێن بە لەرزانەوە
سـەیرم کـرد بە نازەوە کـیـژە کـوردی کـوێسـتـانی
جا وێنەی نەرگس ئەویش چاوی گـەشی هەڵهـانی
تێگەیـیم پێم ڕەزایە چاو کـــەژاڵـی ســـۆرانی
پێـــــشکەشم دایێ دڵم، لـەبری نـازی چاوانـی
پاش ئەوەی دڵم دایێ جـا غـونچـە لالەی کـردۆ
بە غەمزە و ناز و عیشوە، زەردەی گرت، لێوی بردۆ
چەن جـوانە ئەو شـێـوەیە هاوخـوێنی نیـشـتـمـانی!
دەک لەبەر نـازی مـــرم گـــەورە کـــچی گـــۆرانی!
خوێن گـەرمی، سەر بە نازی، خاوەن ناوونیـشـانی
چەن جوان و پاک و شیکی کچکە خانمی خـێلانی
قـــوربانیم لە بەرپێـــیـــا ، گـــیـــانم ئەدەم لەرێیـــا
چی بلّـــێم نیگاری من شـــیکە کـــچی بابانی
ئەی سەروی سەری کانی، ئەی فریشتەی ئاسمانی!
دڵ لە لام سەودا سـەرم یاری جـوانی کـوێسـتـانی!
دڵ بە کەس نەدەی جوانێ عیشقی من یەکجار پاکە
گیان فیدات، دڵ مەشکێنە سەودایی و سینە چاکە
هاتەوە با بێـــتـــەوە، ئەو کـــچـــە لە ناوباغـــەوە
دەم بە پێکەنین و دەســـتی بە گـــوڵە باغـــەوە[2]

---

١- نازانم بەم بەستەیەوە کێ خوێندی.
٢-ئەم بەیتە ئاخرینە فۆلکلۆرەکەی خۆیەتی باقیم بۆ داناوە.





## ناوەرۆک

